ئەمانەتی گشتی
رۆشنبیری و لاوان
(١١)

# هەندێ ئامرازی سینتاکسی
# لە زمانی ئەدەبی ئێمڕۆی کوردیدا

دکتۆر
ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم

الأمانة العامة
للثقافة والشباب
(١١)

دراسات في نحو اللغة الكردية

# بعض الأدوات النحوية في اللغة الأدبية الكردية المعاصرة

الدكتور
ابراهيم عزيز ابراهيم

السعر (٢٠٠) فلس

١٩٨٠

تصميم الغلاف: نزار البزاز

ئەمانەتی رۆشنبیری و لاوان
(١١)

دکتور ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم
مامۆستای زمان و رێزمانی کوردی
لە کۆلێجی پەروەردە ـ زانستگای بەغدا

لێکۆڵینەوە لە سینتاکسی زمانی کوردیدا

# هەندێ ئامرازی سینتاکسی لە زمانی ئەدەبی ئیمڕۆی کوردیدا

بەرگی یەکەم
چاپی یەکەم

---

لە چاپخانەی ( عەلاء ) لە بەغدا لەچاپدراوە

# پێشەکی

زۆر بە پێویستم زانی ، کە کارێکی تایبەت بە ئامرازی سینتاکسیەوە بنووسم و بە پێی توانا لێی بکۆڵمەوە ، چونکە ئامرازی سینتاکس لەرووی ئەرك و وەزیفەوە دەورێکی هێجگار باش دەبینێ لە زمانی ئەدەبی ئیمرۆی کوردیدا ، لە لایەکی ترەوە لە کۆڕی لێ کۆڵینەوەی رێزمانی کوردیدا لە بارەی ئامراز بە تێکڕایی و ئامرازی سینتاکسیەوە بەتایبەتی کارێکی سەربەخۆ نابینرێت ، جگە لەوە نەبێت ، کە نووسەرانی رێزمانی کوردی لا بەلای لە کتێبە گراماتیکیەکانیاندا بابەتی ئامرازیان پێکاوەو لەگەڵ ئەوەشدا نووکی خامەکەیان تۆزێك بەلای ئامرازی سینتاکسیەوە لارکردۆتەوە[١] .

پێکان و باسکردنی ئامرازی سینتاکسی لەلایەن نووسەرانی رێزمانی کوردیەوە کارێکی بێ ئەندازە گرنگە و خزمەتێکی باشی رێزمانی کوردی بە تێکڕایی و سینتاکسی کوردی بەتایبەتی دەکات .

ئێمەش ویستمان ، کە سووچێکی ئەمە پڕ بکەینەوە و هەندێ ناتەواوی راست کەینەوە . هەروەها تا ئامرازی سینتاکسیش باسێکی سەر بەخۆی هەبێت. بۆ ئەم مەبەستانەش بەپێی توانا و ازنستیانە لە هەندێ ئامرازی سینتاکسی کوردیەوە دواین ، جگە لەوەش بۆ ئەوە ، کە کاری ئێمەش بچێتە پاڵ کاری ئەوان و سووچێکی خزمەت گوزاری بگرێ .

باسەکەمان لێکۆڵینەوەیەکی کورتە ـ هەرچەندە دەبا بە قووڵی و فراوانتر بچووبامە ناو باسەکە ـ ، بەڵام بەپێی توانا هاتووە و بەپێی لەمستەوە هاتنەوە نووسراوە ، بەڵکو لە هەلێکی تر یان لە پیاچوونەوەیەکی تردا بە قووڵتر و فراوانتر بڕۆمە ناو باسەکە و قووڵ و فراوانی بکەمەوە .

---

(١) لە بەشی یەکەمی ئەم کارەدا بە دووردرێژی باسی مێژووی کۆلینەوەی ئامرازی سینتاکسی لە زمانی کوردیدا دەکەین .

ئەم کارەمان لەم کورتە پێشەکیە و چواربەش و ئەنجامێك پێکهاتووە .
بەشی یەکەم سەبارەت مێژووی باسەکەیە • بەشی دووەم لە ئامرازەکانـــــی سینتاکسی بەگشتی دەدوێ و باسی ئەم بابەتانـەش دەکات : زاراوەی ئامراز ، پێناسینی ئامراز لە رووی دروست بوونـــــەوە و لەرووی ئەرکەوە • بەشی سێیەمی سەبارەت ئامرازی پەیوەستدارە لە رووی زاراوە و جۆرەکانیەوە •
بەشی چوارەمی لەبارەی ئامرازی گەیەنەرەوە قسە دەکات و زاراوە و جۆرەکانی دەخاتە روو •

نموونەکانی ئـەم کارەشم لە بەرهەمە چیرۆکیەکانی شارەزا و ئەدەبیانی کورد وەکو دکتۆر مارف خەزنەدار و دکتۆر کاوس قەفتان و حوسێن عـارف و بەندی کوردی ، کە بەڕێز کەریم شارەزا کۆی کردوونەتەوە ، هەڵبژاردوون و کۆم کردوونەتەوە و لێم کۆڵینەتەوە و خستوومنەتە ناو باسەکە •

سەرچاوەشم لەبارەی رێزمانی کوردیەوە بە کوردی و عەرەبی و روسی و ئینگلیزی بینیوە و چی لە بارەی ئامرازاوە نووسراوە بە وردی خوێندوومەتەوە و سوودم لێ وەرگرتوون •

**د• ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم**
**١٩٧٩/٢/٢٠**

زۆر لە زانا و ڕێزمانی نووسانی کـــورد و غەیری کورد لە کتێبـــە ڕێزمانیەکانیدا شت و بابەتی بە نرخیان لە بارەی ئامراز بەگشتی و ئامـرازی سینتاکس نووسیووە ، لە گەڵ ئەوەش نووسینەکە لە کەم و کـــۆڕی رزگاری نەبووە ، کە لەم لێکۆڵینەوەیەدا بە وردی لەسەری دەدوێین •

ئەم زانا و ڕێزمان نووسانەش ئەمانەن : ك•ك• کوردۆێیـــف ، چ•خ• بەکاێیف ، س•ی• تسوکرمان ، تۆفیق وەهبـی ، سەعیـــد سدقی کابان ، د•ن• مەکنزی ، نوری عەلی ئەمین ، جگەر خوێن ، محەمەد ئەمین هەورامانی ، مستەفا خوڕەم دل ، ئەحمەد حەسەن ئەحمەد و لێژنەی زمان و زانستەکانـــی کۆڕی زانیاری کورد و دکتۆر ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم ـ خاوەنی ئەم کارە ـ •

جا گەر بە وردی سەرنجی ئـــەم کارانە بدەین ، بۆمان دەردەکەوێت ، کە لە کارەکاندا چەند ناتەواویەك هەیە ، بەڵکو ئەم باسەمان بتوانێ هەنـــدێ ئەم ناتەواویانە چارەسەر بکات و بیانخاتە پێش چاوو • سەبارەت کارەکانـــی ك•ك• کوردۆێیڤەوە چەند تێبینیەك بەرچاوو دەکەوێت ، لەگەڵ ئەوەشدا ، کـە کارەکەی زانای بەڕێز کوردێیڤ بێ گومانە لەوەی ، کە کارێکی زانستیـــە و نوسەری بەڕێز بە قووڵی چۆتە ناو باسەکانەوە و لە رووی سینتاکسیەوە باسیان دەکات • بەڕێز کوردۆێیڤ هەندێ ئامـــرازی بەکـــــار نەهێناون وەکو : ( وە ، هەروەها ، بەڵکو ، هێشتا ، ئەنجا ) لە رووی مێـــژووی داهاتنیانـــەوە باسی نەکردوون • بە ڕای ئــەو ئامرازەکانی لێکدراو کۆنترە لە هی ســـادە • ئامرازی ( بۆ ئەوەی کە ، تاوەکو ، لەبەرئەوە ، چونکە ) ی بە لێکدراو دانەناون لە بارەی دروستبوونیانەوە • (کەی)ی بە ئامراز داناوە • باسی ئامرازی گەیەنەر «کەچی» ناکات • هەروا باسی ئامرازی گەیەنەر «تاە»ی نەکردووە • لە کتێبی ـ

زمانێ کوردی ـ ، کە بەکوردی داناوە دەڵێت ، ئامرازی گەیەنەر خەبەر و فعلان پێکەوە دەبەستێتەوە . ....[1] .

ئێمە لەم کارەماندا باسی ئەم ئامرازانە دەکەین ، کە مامۆستا کوردۆیێف بەکاری نەهێناون ، لە رووی ئەوەی ، کە باسی مێژووی ئامرازەکانی نەکردووە، ئێمە باسی مێژووی ئامرازی گەیەنەر «کە» دەکەین . لە بابەت ئەوەی ، کە دەڵێت ئامرازەکانی لێکدراو کۆنترن لە هی سادە ؟ کە بە پێی تەرازووی زانستی زمانەوە ، کە ووشە یان دەبڕینیتر لە سادەیەوە بوونەتە لێکدراو ؟ جا بەمەوە دیارە ، کە سادە کۆنترە لە هی لێکدراو . ئامرازەکانی (بۆئەوەیکە ، تاوەکو ، لەبەرئەوە ، چونکە ) بە ئاشکرا دیارن ، کە لێکدراون لە دوو بەش یان زیاتر پێکهاتوون[2] . ئامرازی (بۆئەوەیکە) دیارە ، کە لە چوار بەش پێکهاتووە لە ( بۆ + ئەوە + ی + کە ) . ئامرازی (تاوەکو) ئەویش ئامرازێکە و لە دوو بەش پێکهاتووە ؛ لە بەشی (تا)[3] ، کە ئامرازێکی گەیەنەرە و (وەکو)[4] ، کە ئامرازێکی پەیوەستدارە و بە هەردووکیان ئەمەیان پێکهێناوە . ئامرازی (لەبەرئەوە)ش پێکهاتووە لە دوو بەش ؛ بەشی یەکەم

---

(۱) ۱ ـ کوردۆیێف ک. ک. رێزمانی زمانی کوردی لە مەتریالیو یالێکتەکانی کرمانجی و سۆرانی ، مۆسکۆ ، ۱۹۷۸ ل ، ۲٦۹ ـ ۲۸۰ بەروسی .

۲ ـ کوردۆیێف ک. ک. رێزمانی زمانی کوردی لەمەتریالی کرمانجیدا ، مۆسکو ـ لینیگراد ، ۱۹۵۷ ، ل ، ۲۸۵ ـ ۲۹۱ ، بەروسی .

۳ ـ کوردۆیێف ک. ک. کورتە باسێکی رێزمانی زمانیکوردی ـ فەرهەنگی کوردی ـ روسی ل، ۸۸۹ ـ ۸۹۰ ، بەروسی .

٤ ـ قەناتێ کوردۆ زمانێ کوردی ـرێزمان ، یەریڤان ، ۱۹۷۰ ، ل ، ۱۲۱ ـ ۱۲۳ .

(۲) بڕوانە لقی سێیەمی بەشی دووەمی ئەم کارە .

(۳) بڕوانە لقی دووەمی بەشی سێیەمی ئەم کارە .

(٤) بڕوانە لقی دووەمی بەشی چوارەمی ئەم کارە .

(لەبەر) و بەش دووەم (ئەوە) ، کە راناوی نیشانەی دوورە و ئامرازی (لەبەرئەوە) ی گەیەنەری دروستکردووە • ئامرازی (چونکە) ەش هەمیسان لە دوو بەش پێکهاتووە[1] ؛ لە بەشی (چون) ، کە لە بنجدا لە (چۆن)ەوە هاتووە و ئامرازی گەیەنەری (کە)شی چۆتە سەر و ئامرازی ناوبراو دروستبووە : بە هەردووکیان ئامرازی گەیەنەر (چونکە)یان پێکهێناوە • لە زمانی کوردیدا (کەی) بە هیچ جۆر نابێتە ئامرازی گەیەنەر • من سەبارەت ئەوە زۆر شتم پشکنیوە نەم دیتووە ، کە ئەمە ئامرازی گەر بێت • هەروا زۆر چیرۆکم پشکنین ، بەڵکو رستەیەکم دەست کەوێ کە تێدا (کەی) ئامرازی گەیەنەر بێت ، کەچی دەستم نەکەوت ، لەم دێرەی خوارەوە بەولاوە :

**پەلەی بوو ،**
**کەی**
**ئەگاتە کۆلانەکە • (خ• ئا• ل ۷)**

لەم رستە لێکدراوەدا دەربڕینی (کەی) هەیە ، بەڵام ئامرازی گەیەنەر نیە و واتای (کەی ؟ ) پرسیار دەگەیەنێت ، کە لە زمانی کوردیدا هەر بۆ ئەم مەبەستە بەکار دەهێنرێت نەك بە مەبەستی ئامرازی گەیەنەر •

ئێمە سەبارەت ئامرازی «کەچی»[2] دەدوێین ، هەروا بە پێی توانا هەوڵ دەدەین ، کە بەراوردی لە نێوان ئامرازەکان پیشان بدەین • سەبارەت «تا»ش[3] دەدوێین • ئامرازەکانی گەیەنەر ناتوانن خەبەر و فیعلان بەیەکەوە ببەستنەوە هەروەك لەم کارەدا بەدیاردەکەوێ •

---

(۱) بڕوانە لقی سێیەمی بەشی دووەمی ئەمکارە •

(۲) بڕوانە لقی سێیەمی بەشی دووەم ، هەروا بڕوانە لقی دووەمی بەشی چوارەم لەم کارەدا •

(۳) بڕوانە لقی دووەمی بەشی چوارەم •

مامۆستا و زانای بەڕێز چ•خ• بەکایێف لەکارەکانیدا سەبارەت ئامرازەکانی سینتاکسی دواوە ، لەم دوانەدا هەندی شــتی باسکردووە بـــەڕای ئێمە بـــە شێوەیەکیتره وەك ، ئامرازی (ئەگەرکو)ی لە رووی دروست بوونەوە بـــە سـادەداناوە ، کە لێی ورد دەبینەوە ئەم ئامرازە سادە نیـــە و لێکدراوە و لە ئامرازی گەیەنەری مەرجی «ئەگەر» و ئامرازی گەیەنەر «کو» پێکهاتووە ، کە لە دیالێکتی سۆرانیدا بەرامبەری نیە • (یاکو)ی بەئامراز داناوە ، بەڵام (یاکـو) ئامراز نیە ، چونکە لە (یا) و (کو) پێکهاتووە • (یا) لە کرمانجیـــدا راناوی نسبەتدارە بۆ مێینە بەکاردەهێنرێت و (ئەوەی) سۆرانی دەگرێتەوە ؛ جا تێکڕای ئامرازەکە لە سۆرانیدا (ئەوەیکە) دەگرێتەوە • دەربڕینی (ئەوەیکە) لـــە دیالێکتی سۆرانیدا ئامرازی گەیەنەر نیە ، ئەوەی ئامرازە لە دەربڕینەکـــەدا هەر تەنها (کە)یە • ئەوەی دەمێنێتەوە لە دەربڕینەکـــەدا ووشەی (ئەوەی) لەسۆرانیدا و ووشەی (یا) لە کرمانجیدا پێیان دەوترێت ووشەی یان رانـــاوی نسبەتـــدار • بـــەروسی پێی دەترێـــت ( سەئەتنـــەسیتلنیێ سلەڤـە Saotnasitelnie slava ) هەروا باسی هەندێ ئامرازی تر دەکـات وەك : (ماکو ، ئەماکو ، یاژی ، وەختێکو ، نوساژی ، هنژی ) • بەڕێـــز و هێژا مامۆستا بەکایێف چ•خ• ئامرازی (وەکو) ی بەکارهێناوە ، کـــەوا باسی دەکات وەك ئامرازێکی گەیەنەر ؛ بەڵام لێکۆڵینەوەی ئێمە و نموونەکانی ئێمـە لە دیالێکتی سۆرانیدا پیشانمان دەدەن ، کە ئـەم ئامرازە ئامرازێکی پەیوەستدارە نەك گەیەنەر[١] • هەمان ئامراز لە دیالێکتی سۆرانیشدا هەیە • بەدرێژی باسی (چەوا) دەکات وەك ئامرازێکی گەیەنەر بەڵام تێبینی ئێمە بۆ ئـــەوە دەچێت ، کە (چەوا) ئامرازی گەیەنەر نیە و هەروا ئامـــرازی پەیوەستداریش نیـــە ؛ چونکە (چەوا) جێگای (چۆن ؟ ، هەر) دەگرێتەوە لەم رووەوە (چەوا) دوو

(١) بڕوانە لقی سییەمی بەشی دووەم ، هـــەروا لقی دووەمی بەش سێەمـــی ئەم کارە •

ئەركى تر لە ڕێزماندا جێبەجێ دەكات ؛ یەكێكیان ڕاناوی پرس دروست كردنو ئەوی تریان ڕاناوی دیارخەر • ئەو كاتە (چەوا) دەبێت بە ئامراز ، كە لەگەڵ ئامرازی گەیەنەر (كە)دا هات و دەربڕینی (چەواكو) دروست دەبێت ...[1] •

هەردوو دكتۆران كەریمی ڕەحمانی ئەیوبی و س•ئاء سمیرنۆفەی خێزانـــــی لە كتێبەكەیاندا لە ئامرازەكانی سینتاكس كوردیـدا دواون • بەڵام هەنـــــدێ ئامرازیان باس نەكردوون وەكو ئامرازەكانی (ئەنجا ، هێشتا ، بەڵكو ) ئێمە لەم كارەدا بە درێژی باسیان دەكەین ...[2] • لە ڕووی ئەرك و فەرمانـــــــەوە باسیان نەكردوون ، شوێنی ئامرازەكانیان لەنـــــاو ڕســـــتەی كوردیدا باس نەكردوون ، ئێمە ئەمەش باس دەكەین • دەربڕینی (هەتاكونێ)ی بە ئامــراز داناوە ، بەڵام لەرووی ئەوەی ، كـە ئەمە ئامرازێكی شێوەی موكری زمانـــــی كوردیە ڕاستە ، بەڵام لە نووسینی ئەدەبیدا كەم بەكار دێت چونكە لە شێوەی ئاخاوتنا زۆرتر بەكار دەهێنرێت ...[3] •

دكتۆر د•ن• مەكەنزی لە كارەكەیدا بەس باسی ئامرازی گەتەر «كە» دەكات لە باسی هەندێ ڕستەدا ...[4] •

بەڕێز مامۆستا تۆفیق وەهبی لە ئامراز دواوە ، ئــــەو ناویان بـــە ووشــە دەبات ، بەڕای ئێمە هەر چەندە لەرووالەت ووشەن ، بەڵام لە ئەرك و ئامرازی

---

(١) ١ ــ بەكاییێف چ• خ• زمانی كوردەكانی یەكیەتی سۆڤیەت ، مۆسكو ، ١٩٧٣ ل، ٢٣٠ بە ڕوسی •
٢ ــ بەكاییێف چ• خ• زمانی كوردەكانی ئازربایجان ، مۆسكۆ ، ١٩٦٥ ٧ ، ٨٥ ، ٨٩ بەڕوسی •

(٢) بڕوانە لقی سێیەمی بەش دووەم ، هـــــەروا لقی دووەمی بـــەش سێیەمی ئەم كارە •

(٣) ئەیوبی ك• ڕ• ، سمیرنۆڤە ی• ئا• دیالێكێ كوردی موكری لێنینگراد ، ١٩٦٨ ل ، ٦٤/٦٥ بەڕوسی •

(4) Mackenzie D. N. Kurdish dialect studies I london 1961.

فەرمان دان ، لەبەر ئەوە هەر ئامرازن و ووشە نین • بەتێکەڵاوی لە سەر ئامرازەکان دەدوێت و لێکی جیا نەکردوونەتەوە • ئێمە لەم کارەدا بەرێك و پێکی باسیان دەکەین و لێیان دەدوێین • ژمارەیەکی زۆری لە ئامرازەکان باس نەکردوون و لەبارەی ئامرازی گەیەنەرەوە نادوێت ...[1] •

مامۆستا سەعید سدقی کابان بە تێکەڵاوی و پەنا پەنا لەبارەی هەندێ ئامرازەوە دواوە • بەڵام دوانێکی کورت • لەبارەی ئامرازی گەیەنەر «کە»وە چەند قسەیەکی کردووە ...[2] •

بەرێز نوری عەلی ئەمین لە ئامرازەکانی کوردی دواوە ، زاراوەی پێبەستی بۆ ئامرازی پەیوەستدار بەکار هێناوە • ئامرازەکانی (مەگەر) و ( چونکە ) ی بە ئامرازی لێکدراو داناون لە رووی دروست بوونیانەوە • ئەمەیان راستە ، کە هەر دوو ئامرازەکان لێکدراون و لەدوو بەش پێکهاتوون لە ( مە ) و ( ئەگەر ) و ئەوی تریان لە ( چون ) و ( کە ) • مامۆستا نوری عەلی ئەمین بە رێکوپێکی لە بارەی ئامرازەکانەوە نەدواوە • بە تێکەڵاوی باسی کردوون • نوری عەلی ئەمین ( ش،و ) ی بە ئامراز داناوە ، بەڵام لێرەدا بە لێکۆڵینەوە لای ئێمە دەردەکەوێت ، کە هەر تەنها ( ش ) ئامراز و ئامرازێکی پەیوەستداری لکاوە و ( و ) هیچ پەیوەندی بە ئامرازەوە نیە • هەروا مامۆستای بەرێز ( نە• ) ی بە ئامراز داناوە ؟ بە رای ئێمە ئەم ( نە• ) • بە هیچ جۆرێ ناچێتە ناو قاڵبی ئامرازی سینتاکس بەڵکو تەنها ئامرازی نەفیە و بۆ نەفی بەکاردێت نەك بۆ بەستنەوەی دوو رستە بەیەکەوە • لە هەندێ گۆڤەرەکانی زمانی کوردی و دیالێکتی کرمانجی سەرو بە ( نەك ) بەکار دێت ...[3] •

جگەر خوێن هەر باسی ئامرازەکانی گەیەنەر دەکات وەك ( ئەگەر ،

---

(١) تۆفیق وەهبی قواعد اللغة الکردیة ـ الباب الثانی ـ بغداد ، ١٩٥٦ •
(٢) سعید سدقی کابان مختصر صرف‌و نحوی کوردی بەغدا ، ١٩٢٨ •
(٣) نوری عەلی ئەمین رێزمانی کوردی ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ل ـ ٢٣٠ ...هتد•

گەر ، ئەر ، وەر ، مەگـەر ، هەکە ، کـو ، هەتا ، حتا ، هنگـــی ) لێـرەدا ئامرازەکانی ( ئەگەر ، گەر ، مەگەر ) هەر یەك ئامرازن ، بەلاَم بـــە رواڵەتی دروست بوون لێك جیان وەك ( گەر ، مەگەر ) هەر ئامرازی ( ئەگەر ) ن ، هەروا ( ئـەر ) ئەویش هەر بەواتا و وەزیفەی ( ئەگەر ) بەکار دەهێنرێت • ( هەکە ) لە دیالێکتی سۆرانیدا بەرامبەر ( هەرکە ) دەوەستێ ، لـــەم دیالێکتەدا ( هەرکە ) ئامراز نیە ، بەڵکو لە دەربڕینی ( هەرکە ) دا هەر ( کە ) ئامرازە و بـەس •

مامۆستای بەڕێز جگەر خوێن ( هنگی ) بە ئامراز داناوە • بەلاَم بەڕای ئێمە ( هنگی ) ئامراز نیە ، کە بتوانێ دوو رستە بە یەکـــەوە بەستێتەوە ، (هنگی) لە ناوچەی موکری و رواندز و میرگەسوور و سیدەکاندا و هەنـــدێ ناوچەکانی تردا بە ( هەنگی ) بەکار دەهێنرێ ؛ ( هەنگی ) واتای ئەوکـــات دەدات ؛ ( ئەوکات ) یش لە زمانی ئەدەبی کوردیدا بە ئامراز نەهاتووە و نـا یەت و بەکار ناهێنرێت ؛ هەروا ( هەنگی ) نە ئامرازی پەیوەستدارە وە نـــە ئامرازی گەیەنەریشە •

مامۆستا جگەر خوێن بە تێکەلاَوی باسی ئامرازەکانی کـــردوون و باس ئامرازەکانی پەیوەستدار ناکات •••[1] •

محەمەد ئەمین هەورامانی لە کتێبەکەیدا[2] باسی ئامرازی کردووە • لە باسەکەیدا ریکوپێکی نابینرێت ، باسی ژمارەیەکـــی تەواو لە ئامرازەکانـــی پەیوەستدار و گەیەنەر ناکات • باسی ئەوە دەکات ، کە ( و ) دەتوانێ جگــــە لە بەیەك بەستنەوەی دوو رســـتە دوو ناو یـــان دوو ووشەی تر بە یەکەوە بەستێتەوە • ئامرازی ( کەوا ) بە ئامرازی گەیەنەر داناوە ، کەچی لە ( کەوا ) دا

---

(١) جگەر خوێن آوا ئو دەستورا زمانێ کوردی بەغدا ، ١٩٦١ ل ، ٩٩ •
(٢) محەمەد ئەمین هەورامانی سەرەتایێك لە فیلۆلۆژی زمانی کوردی ، بەغدا، ١٩٧٣ ل ، ١٣٩ •

هەر تەنها ( کە ) ئامرازە و گەیەنەریشە ، بەڵام ( وا ) پەیوەندی بە ئامرازەوە نیە ، بەڵکو هەبوونی لێرەدا بۆ بەتین کردنی واتا و ئەرکی ( کە ) یە • بۆ ئەمە یان بۆ تێکڕای ڕای مامۆستا محەمەد ئەمین هەورامانی سەبارەت ئامرازی ( کە ) دەتوانی بنۆڕیتە کارەکەم بەکوردی یان بەروسی ...[۲] •

لێژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد بە شێوەیەکی دوور و درێژ لە ئامراز دواون و باسی ئامرازی مەبەستمانیشمانی کردووە • لە باسەکەدا لێژنەی هێزا بەداخەوە یاسایەکی زانستی بەدی نەکردووە ، باسەکە هەر باسێکی ئاسایە و هەروا بە شێوەیەکی رەخنەیی تەواو لە ئامرازەکان نەدواون تەنها چەند ئامراز هەیە ، کە لە لایەن رێزمان نووسانەوە نووسراوە چ لە ووتارەکانیاندا یان لە کتێبەکانیاندا ئەوانیش تۆماریان کردووە و کۆیان کردۆتە، لەبەر ئەوە باسەکە هەر کۆکردنەوەیەکی گشتی ئەو ئامرازانەن و بەس و لا بەلایت لە سەر هەندێکیان دواون • لە باسەکەی کۆڕدا ئێمە چەند شتێکمان تێبینی کردووە وەك : ( چۆن ) ئامرازی سینتاکس نیە و ئەوان بە ئامرازیان داناوە • ئەوەی دیارە ئەوەیە ، کە ( چۆن ) بۆ پرسیار دروست کردن راستە ئامرازە ، بەڵام بۆ بەستنەوە دوو رستە بەیەکەوە ئامراز نیە ، جا هەڵەکەی کۆڕ لێرەدایە ، کە ( چۆن ) بە ئامرازی پەیوەستدار دادەنێن و دەڵێن ، کە ئەم ئامرازە دوو رستە بەیەکەوە دەبەستێتەوە • بەشێوەیەکی تێکەڵاو باسی ئامرازەکانی گەیەنەر و پەیوەستدار دەکەن ، کەچی دەبێ هەردوو جۆرە ئامرازەکە لێك جیابکرێنەوە ، چونکە جیاوازی زۆر لە نێوایاندا هەیە • لە رووی دروست بوونی ئامرازەکانەوە نەدواون ، دەڵێن ، کە ئامرازی ( و ) ی پەیوەست کات پیشان دەدات بەڵام بەم لێکۆڵینەوەیەی ، کە ئێمە لەبەر دەستمانە

(۱) د• ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم رستەی لێکدراوی شوێن کەوتووخواز لەگەڵ رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری لە دیالیکتە ناوەندیەکانی زمانی کوردیدا ، مۆسکۆ ، ۱۹۷۵ ل ، ۱۰–۱۲ بەروسی (دەستنووس بە کوردی)

دەردەکەوێت ، کە ئەم ئامرازە بە هیچ جۆر واتای کات نا بەخشێت و کـــات پیشان نادات • لە کارەکـەی لێژنـەدا هاتووە ، کە نەفی و ئامراز بەیوەندیان بەیەکەوە هەیە ، گومان لەوەدا نیە ، کە نەفی و ئامراز پەیوەندیان پێکـــەوە هەیە • هاتنی ئامرازی ( نەفی ) ـ نە ـ لە زمانی کوردیدا هەندێ جار لەگەڵ ئامرازی پەیوەستدار ( وەکو ) و دەربڕینی ( نەوەکو ) دروســـت دەکات وا ناگەیەنێ ، کە نەفی و ئامراز پەیوەندیان پێکەوە هەیـە • سەرەڕای ئەوەش هەریەکە بۆ مەبەستێك لەرستەدا بەکـار دێن • لیژی بەڕێز دەڵێ ، (ش) بۆ بەستنەوەی دوو رستە بەکار دێت بەڵێ ئەمە راستـە ، بەڵام گەر هات لە نـاو رستەدا لە ( ش ) زیاتر هیچ ئامرازی ترمان نەبوون ، بەڵام گەر ئامرازی تـر هەبوون وەك ئامرازی « و » بەتایبەتی ئەوە لێرەدا « ش » ئامرازی پەیوەســـت نیە ، بەڵکو ئامرازی پـەیوەست ئامـــرازی « و » • • « ش » لێرەدا بـــۆ دووبارەکردنەوە بەکاردێت وەك بڵێـین منیش ، تۆش ، ئەویش ••• هەروەها • لەکتێبەکەدا هاتووە ، کە دەبێت لەگەڵ ئامرازی « و » ی پەیوەستدار « و » یەکی تر بێت ، چونکە هاتنی « و » ی پەیوەستدار ئامرازێکی سەربەخۆیە و توانـــای زۆری هەیە بۆ بەیەك بەستنەوەی دوو رستە و ئەرکی خۆی دیارە و پێویستی بە شتێکی تر نیە ، هەروا سەبارەت ئامرازی « و » ی پەیوەستدار دەڵێن ، کە ئەمە دەتوانێ ببێ بەبزوێن ، بەڵێ راستە « و » پیتێکی بزوێنـــەرە لە زمانـــی کوردیدا ، کە لە قەوارەی فۆنۆتێکدا باس بکرێت ، بەڵام گەر باسی پێکـــەوە بەستنەوەی دوو رستەی سادە بێت « و » پیت نیە ، بەڵکو ئامرازە و نابێ ناوێکی تری لێبندرێ • لێژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد باسی ئامرازی « وە » ناکات • دەڵێن ، کە ئـــەم ئامرازە عەرەبیە و کوردی نیـــە ، بۆیـــە ئێمە لێ نادوێین • بە کۆڵینەوەی ئێمە لەئامرازەکانی زمانـی کوردیـــدا زۆر ئامرازی « وە » کەوتۆتە بەرچاوو ، کە دوو رستەی بەیەکەوە بەستۆتەوە • جا لەبەر ئەوە « وە » ئامرازی پەیوەستدارە و دوو رستە بەیەکەوە دەبەستێتەوە •

له زمانی کوردی و نووسینی کوردی و ئاخاوتنی کوردیشدا زۆر بەر چاوو و گوێ دەکەوێ • گەر هەر هەمان کتێبی رێزمانی کوردی کە لێژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد دایناوە بکۆڵینەوە گومان لەوەدا نیە پتر لە هەزار ئامرازی « وە » مان بەرچاوو دەکەوێ • بۆ نموونە سەیری ئەم نموونەی خوارەوەبکەن :

لەو کارانەدا ، کە پاشگری ( ەوە ) یان بە دوادا دێ ،

**وە**

**بە هۆی ( اندن ) ەوە کراون بە متعدی ٠٠٠**
**یان لەدەنگەوە بوونەتە کار ، (اندن) لە پێشەوە دێ •**

**( رێزمانی ئاخاوتنی کوردی ل ، ١٢٢ )**

گەر سەیری ئەم رستەیە بکەین دەبینین ( وە ) وەك هەموو ئامرازەکانی پەیوەستدار دوو رستەی بەیەکەوە بەستوونەتەوە ، کە ئەمانەن : **[ پاشگری ( ەوە ) یان بە دوادا دێ ] [ بە هۆی ( اندن ) ەوە کراون بە متعدی ]** • ئێمەش لەم کارەماندا وەك ئامرازێکی پەیوەستدار باسی ئامرازی « وە » دەکەین •

لێژنەی بەرێز هەموو ئامرازەکانیان لەقاڵبی ئامرازی ( عطف ) دا Conjection باسکردوون • ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە ، کە هەموو ئامرازەکان ناچنە پاڵ ئامرازەکانی ( عطف ) ەوە •

( نەء ) بە ئامرازی ( عطف ) دانراوە ، هەروەك لە پێشدا وتمان ، کە (نەء) ئامراز نیە بۆپێکەوە بەستنەوەی دوو رستە •

ئامرازی ( کە ) بە راناوی لێکدەر باس دەکەن ؟ ئەبێ بزانین ، کە ئامرازی ( کە ) ئامرازێکی گەیەنەرە ؟ رستەی شوێن کەوتوو دەگەیەنێتە رستەی سەرەکی و بە هیچ جۆر راناو نیە بۆ پتر روونکردنەوە دەتوانن سەیری کارەکەم بکەن ( رستەی لێکدراوی شوێن کەوتووخواز لە گەڵ رستەی شوێن

کەوتووی دیارخەری لە دیالێکتە ناوەندیەکانی زمانی کوردیدا ـ بەشی یەکەم ـ ڕۆڵی ئامرازی گەیەنەر « کە » بە ڕوسی و بە کوردی ـ دەستنووس ـ ) •

لێژنەی زمان و زانستەکان دەڵێت ، کە ئامرازی (یا)دوو بـــارە دەکرێتەوە و ( یا •••• یا ) دروست دەکات ، بەڵام بەڕای ئێمە ئامرازی « یـا » دووبـــارە ناکرێتەوە بەڵکو دەربڕینەکانی ( یا ••• یا ، یان ••• یان ) لە عاستی خۆیاندا ئامرازی سەربەخۆن و لە ئەرك و واتادا لە « یا » جیا دەبنەوە •

لێژنە ئامرازی نەفی « نە » یان بە ئامـــرازی بەستنەوەی دوو رستـــە بەیەکەوە داناوە ، بەڵام لێکۆڵینەوەی ئێمە « نە » هەر بە ئامرازی نەفی دادەنێت و هیچ پەیوەندیێکی بە ئامرازی پەیوەستدارەوە نیە •

خاوەنی کتێبی ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی ئامرازی « تا » ی بە ئامرازی گەیەنەر باس نەکردووە و دەڵێت بۆ مەرجە ، کەچی زۆر ئاشکرایە ، کـــە ئـەم ئامرازە یەکێکە لە ئامرازە باوەکانی گەیەنەری زمانی کوردی ، کە رستەی شوێن کەوتووی ئەندازەیی وئامانجی دەگەیەنێتە رستەی سەرەکی •

ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی کۆڕ بە بێ کۆڵینەوە لە سەر ئامرازەکانیـــان قسەکرووە • « بەشکو » ئامرازێکی جیا سەربەخۆ نیە هـــەروەك لێژنە باسی دەکات ، بەڵکو ئەمە حاڵە تێکی ئامرازی « بەڵکو » ی پەیوەستدارە •

لێژنە « جگە » ی بەئامراز داناوە ، کەچی ( جگە ) ئامرازێك نیە ، کـــە دوو رستە بەیەکەوە ببەستێتەوە •

لە کتێبی ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردیدا هاتووە ، کە « هەر » ئامرازە ئێمـــە لەو قەناعەتە داین ، کە « هەر » ئامراز نیە و راناوێکی نادیارە و هیچ پەیوەندیێکی بەئامرازەوە بەگشتی وە بەتایبەتی لەئاست بەیەکەوە بەستنەوەی دوو رستە نیە •

لە کتێبی ناوبراودا « هەرکە » بە ئامرازی لێکدراو دانانێن ، بەڵام کـــە

سەیری دەربڕینی « هەرکە » دەکەین لە دوو بەش پێکهاتووە لە بەشی « هەر » و بەشی « کە » ، ئەمەشیان لە هەمان کاتدا ئامرازە و بەڵگەی کات دەگەیەنێ •

لێژنە لە کتێبەکەیدا باسی ئامرازی « کەچی » گەیەنەر دەکات ، بەڵام لە باسەکەدا بە هەڵە چوون و سەریان لێ دەرنەچووە ، کە چیە • بۆیە دەڵێت ، پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکیترە • دیارە ، کە ئامرازی « کەچی » ئامرازێکی گەیەنەرە و رستەی شوێن کەوتووی ناچارەیی دەگەیەنێتە رستەی سەرەکی • هەروا « کەچی » بەرامبەر بە « ئەگەرچی » و « هەرچی » یان داناوە ، بەڵام بەڕای ئێمە ئەمە تەواو نیە و ناتەواو و نا راستە ، چونکە هیچ پەیوەندیێکی سینتاکسی یان واتایی لەگەڵ « کەچی » و « ئەگەرچی » ، « هەرچی » دا نیە • ئێمە بەشێوەیەکی تر لەسەر ئامرازی « کەچی » گەیەنەر دەدوێین •••[1] •

هەر وەك لە کتێبی ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردیدا هاتووە ، کە چەند کەسێکی تر لەئامراز دواون وەك : مامۆستا رەشید کورد لە کتێبەکەیدا ( ڕێزمانا زمانێ کوردی ، ل ، ٢ ) ناوی ئامراز دەبات بە ئامرازی « پێوەند » •••[2] •

مستەفا خورەم دل باسی هەندێ ئامرازی سینتاکس کردووە وەك : ( وا ، ئەوتۆ ، کە ، چی ، چە ) ، بەڵام وادیارە لەم هەموو ئامرازانە هەر تەنها « کە » ئامرازە و گەیەنەرە ؟ ئەوانیتر ئامراز نین ، بەڵکو شتی تری ڕێزمانین وەك : « چی ، چە » راناوی نادیارن ، « وا » دەربڕینێکە دەکەوێتە سەر « کە » و ئەرکی بەهێز دەکات •••[3] •

---

(١) لێژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەغدا ، ١٩٧٦ ل ، ٣٢٦ •

(٢) هەمان سەرچاووە •

(٣) مستەفا خورەم دل صرف دستور زبان کردی ، تیریز ، ١٣٤٧ ك ل ، ٧٥ بە فارسی •

ئەرنست مەکارۆس باسی ئامرازی « کە » دەکات و دەڵێت ، ئـەم ئامرازە دەتوانێ رستەی شـــوێن کەوتووی دیارخـــەری بگەیەنێتـــە رستەی سەرەکی ...(2) .

ئەحمەد حەسەن ئەحمەدیش لەکارەکەیدا لەبارەی ئامرازی « کـــە » دواوە . مامۆستای ناوبراوی بەرێز « کە » بە راناو دا دەنێت بەڵام « کـــە » بە هیچ جۆر راناو نیە بەڵکو ئامرازە و گەیەنەریشە ...

دکتۆر کوردستانی گیوی موکریانی لە ووتارەکەیدا دەڵێت ، کە لە زمانی کوردیدا ئامرازی « و » دەوری ئامرازی خستنەسەر ( ئیزافەت ـ نووسەری ئەم کارە ـ ) دەگێرێ تەنێ لەو بارەدا ، کە دیارخەر بریتی بێ لە ئاوەڵنێـــو ، بۆ وێنە :

جزیری هۆنەرێکی هەست باریـــك و خەیاڵ ناســـك و خۆش راوێژ و لێبڕابوو . ( دیوانی جزیری ) .

هەروا نووسەری ووتار دەڵێت ، لە رستەی سەرەوەدا گەربێت ئامرازی « و » بە ئامرازی خستنە سەر ( ـی ) بگوردرێت ، ئەوا واتای رستە و سازدانی لە رووی رستە سازێوە ناگۆڕێ :

جزیری هۆنەرێی هەست باریکی خەیاڵ ناسکی خۆ راوێژ لێبڕابـوو . دکتور کوردستان فاریزەش لە دەوری ئەرکی ئیزافەت دەداتە قەڵەم .

ئێمە لە ئاست ئەمەوە دەڵێین ، کە خستنە سەر ( ئیزافەت ) ئامراز نیـە ، من لە نامەی دکتۆرای خۆمم بە ئامراز لەقەڵەم نەداوە ئەمە لە لایەك لە لایەکیتر ئامرازی « و » لێرەدا ووشەکانی رستەکە ، کە ئەمانەن ( بازیك ـ خەیاڵ ـ

---

(2) Ernest N. Macarus-A kurdishgrammar daccriptive analyeis of knrdish of sulaimamiya Irao. New york-1958 p. 92.

ناسك ـ خۆش ، راوێژ ـ لێبڕ ) بەیەکەوە دەبەستێتەوە جا لە رووی ئەرکـەوە تۆزێك خۆی لە ئیزافەت نزیك دەکاتەوە ، ئەگینا ئیزافەت و ئامرازی « و » لێك دوورن • لەبەر ئەوەش ناتوانین بلێین ، کە ئامرازی « و » دیارخـــەر و دیارخراو بەیەکەوە دەبەستەوە ، چونکە ئەوکاتە زاراوەی دیارخەر و دیارخراو بەکاردێت ، کە بە یارمەتی ئیزافەتەوە پێکەوە ببەسترێتەوە یانی لە دەربڕینـــی سنیتاکس دیارخراو و دیارخەردا ئیزافەتیش یەکێکە لە وان •••[1] •

منیش ، کە خاوەنی ئـەم کارەم ، لـە نامەی دکتـــۆراکەمدا سەبارەت ئامرازی « کە » بەتەنێ دواوم و رۆلی ئەم ئامرازەم لە گەیاندانی رستەی شوێن کەوتووی دیارخەری بەرستەی سەرەکیەوە بـــەدرێژی باسکردووە ؛ هـەروا لەسەر ئەوەش دواوم ، کە ئەم ئامرازە دەتوانێ چەند رستەیەکی تری شوێن کەوتوو بەرستەی سەرەکیـــەوە ببەســـتێتەوە لە ناو رســـتەی لێکـــدراوی شوێنکەوتووخوازدا ؛ لەبەر ئەوە ناویم ناوە ئامرازی گەیەنەری گشتی •••[2] •

بەم کورتە مێژووە سەبارەت نووسین لەبارەی ئامرازی سینتاکسیەوە لـــە زمانی کوردیدا ، توانیمان ئـــەوە بخەینە بـەرچاوو ، کـــەچی لەم رووەوە نووسراوە و ئەو هەولانـــەی ، کـــە لێرەدا لەقەلـەم دراون چین و راستی و ناتەواویان چیە و چی باسکراوە • لەگەل ئەوەشدا ئەوەی لەم رووەوە نووسراوە دەمەوێ دووبارە بکەمەوە ، کە کارێکی هێجگار گرنگـــە لە رێزمان و زانستی زمانی کوردیدا و خزمەتێکی زۆر باش دەکات •

---

(١) زانکۆ گۆڤاری زانکۆی سلێمانی زانستی ـ بەرگی ، ٤ ژمارە ، ١ ســالی ١٩٧٨ ل ، ١٦٦ •

(٢) د• ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم رستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخواز لەگەل رستەی شوێنکەوتووی دیارخـەری لە دیالێکتـە ناوەندیـەکانی زمانی کوردیدا نامەی دکتۆرا ، مۆسکۆ ، ١٩٧٥ بەرووسی هەروا دەستنووسەکەی بەکوردی •

لەم بەشەدا باسی زاراوەی ئامراز و پێناسینی ئامـــرازو ئامراز لە رووی دروستبوونەوە و ئامراز لە ڕووی ئەرکەوە دەکەین •

## ١ ـ زاراوەی ئامراز

تا ئێستا لە ڕێزمانی کوردیدا زاراوەی ئامراز تەحدید نەکراوە کـەچی دەگرێتەوە ؟ هەر وەك دیارە ، کە وترا ئامراز جۆرەها شت وەپاڵ خۆی دەنێ • وەك جاری وایە بە پێشگر و پاشگریش دەوترێ ئامراز ، جگە لەوەی ، کـــە ئامراز ناوە بۆ هەندێ دەربڕین ، کـە دوو رستە بەیەکـەوە دەبەستێتەوە یـان رستەیێك دەگەیەنێتە رستەیەکیتر ، هـــەروا بەوەش دەوترێت ، کە ناوی تاك دەکاتە کۆ ، ناسراو ، نەناسراو ••• هتد •

ئامراز زاراوەیـــەکی باش هاتووە لـــە ڕێزمانی زمانی ئەدەبی ئیمڕوی کوردیدا ، هەر بەتەنێ لە ڕێزمان نەچەسپاوە ، بەڵکو لە گفتوگۆ و ئاخافاتنیشدا بەکار دەهێنرێت • هەروەك کابرایەکی پینەدۆز بە بزمار و چەکوش و گـــاز و شتە پێویستیەکانی تر دەڵێت ئامرازەکانی پینەدۆزی ، هـــەروا بگرە لە هەموو جۆرەکانی تری هونەری •

هەندێ کەس لە بریتی ( ئامراز ) دەڵێن ، ( ئامڕاز ) هەر چۆنێك بێت ووشەی ئامراز زۆر بەکـار هاتووە و لەسـەر زار سووکتر دێت لە ووشـەی ( ئامڕاز ) لەبەر ئەوە ئێمە زاراوەی ( ئامراز ) بەکار دەهێنین نەك ( ئامڕاز ) •

لە زمانی ئەدەبی ئیمڕۆی کوردیدا جۆرەها ئامراز هەن وەك ئامرازی : کو ، ناسراو ، نەناسراو ، بچووککەرەوە ••• هتد • ئێمـــە لەم کارەدا هـەر

ئامرازی سینتاکس باس دەکەین بە مەبەستی ئەو جۆرە ئامرازانە ، کە دوو رستە پێکەوە دەبەستنەوە یان رستەیێك دەگەیەننە رستەیەکی تر •

## ـ ٢ ـ

## پێناسینی ئامرازی سینتاکسی

ئامرازی سینتاکسی ئەو جۆرە ئامرازانەن ، کە دوو رستەی سادە بەیەکەوە دەبەستنەوە یان رستەیەکی شوێنکەوتو دەگەیەنـە رسـتەی سەرەکی لە نێو رستەی لێکدراوی شوێنکـەوتووخوازدا • بـەم ئامرازانە دەوترێت ئامرازی سینتاکسی ، چونکە ئەو ئەرکەی ، کە جێبەجێی دەکـەن دەکەوێتە ناو قاڵبی سینتاکسەوە •

ئامرازەکانی سینتاکسیش ، کە ئێمە لەم کارەدا قسەیان لەسەر دەکـەین ئەمانـەن :

« ئێستا ، وە ، بەڵام ، ئەوسا ، بەڵکو ، ش ، ئینجا ، یا ، ئەگینا ، وەکو ، و ، کە ، بۆئەوەی ، کەچی ، تا ، چونکە ، ئەگەر ، بۆیە » •

## ـ ٣ ـ

## ئامراز لە ڕووی دروستبوونەوە

ئامرازە سینتاکسـیەکانی زمانیکوردی لـەڕووی دروسـتبوونـەوە Structur دەکرێن بە دوو بەشـەوە ؛ ئامرازی سینتاکسی سادە و ئامرازی سینتاکسی لێکدراو •

**(١) ئامرازی سینتاکس سادە :**

ئەمانە ئەو جۆرەن ، کە سادەن و لە یەك بەش پێکهاتوون • لـە زمانی کوردیدا ئامرازە سینتاکسیەکانی سادە ئەمانەی خوارەوەن :

**ئێستا**
**وە**
**بەڵام**
**ئینجا**
**ش**
**و**
**کە**
**تا**
**بۆیە**
**تا**
**ئەگینا**

**(٢) ئامرازی سینتاکس لێکدراو :**

**ئەوسا**
**بەڵکو**
**وەکو**
**بۆئەوەی**
**کەچی**
**چونکە**
**ئەگەر**

ئەمانەش ئەوجۆرە ئامرازانەن ، کە لە دوو بەشەوە یا پتر پێکهاتوون و پێکەوە ئامرازی سینتاکسی‌یان دروستکردووە • لە زمانی ئەدەبی ئیمڕۆی کوردیدا ئامرازە سینتاکسیەکانی لێکدراو ئەمانەی خوارەوەن :

ئەوەی شایانی باسە لێرەدا ئەوەیە ، کە ئێمە ناتوانین لەم کارەدا بەتەواوی بچینە بنج و بنەوانی مێژووی ئامرازەکانی سنیتاکسی کوردی ، بەڵکو ئەوە پێویستی بە لێ‌کۆڵینەوەیەکی تایبەتی هەیە ، کە ئەم گیروگرفتە چارە سەر بکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانین هەر چۆنێك بێت لە ئاست ئامرازە سینتاکسیە لێکدراوەکانەوە بدوێین و بەهۆی رواڵەتیانەوە بتوانین قەناعەتی ئەوە دروستکەین ، کە ئامرازەکانی سەرەوە لێکدراون و سادە نین • لێرەدا لەسەر هەر ئامرازە سینتاکسیە لێکدراوە دەدوێین •

**ئـەوسـا :**

بە لێکۆڵینەوە و وردبوونەوە لەم ئامرازە بۆمان دەردەکەوێت ، کە ئامرازێکی لێکدراوە ، چونکە لە دوو بەش پێکهاتووە • لە ( ئەو ) و ( سا ) • جا لێرەدا ( ئەو ) راناوی نیشاندەرە بۆ دوور و لە هەمان کاتیشدا راناوی جودای کەسی سێیەمی تاکە • ( سا ) لە ساتەوە هاتووە ، کە واتای ( کات ) دەدات • بەشی ( سا ) هەروا لە ( سات ) ەوە کورتکراوەتەوە ؛ ئیتر ( ئەو ) و ( سا ) بـە هەردووکیان ( ئەوسا ) یان پێکهێناوە و لـە رێزماندا دەتوانێ دوو رسـتە بەیەکەوە ببەستێتەوە •

**بـەڵـکو :**

لێرەدا دیارە ، کە ( کو ) بەشێکە لە دروستکردنی ئامرازی لێکدراوی ( بەڵکو ) • ( کو ) لە عاستی خۆیدا ئامرازێکی گەیەنەرە لە دیالێکتی کرمانجی خوارووودا • ئەم ئامرازە توانیویەتی ، کە زۆر ئامرازی لێکدراو دروست کات • لەبەر ئەوەی ، کە لە رێزمانی کوردیدا زۆر شت هەیە ، هەردوو دیالێکتەکە لێك نزیك دەکەنەوە و بەیەکی دادەنێن جا لەمانـە ( کو )ە • ئەمە هەر چۆن لەوێدا دەتوانێ ئامرازی لێکدراو دروسـت کات ئاواش لێرەدا دەتـوانێ • هەبوونی ئەمەش سەرەڕای ئەوە وا دەگەیـەنێ کـە لە دیالێکتی کرمانجـی خوارووشدا ئامرازی ( کو ) هەیە ، بەڵام لەو شوێنانەدا خۆی شاردۆتەوە و ماوەتەوە • بەشەکەی تری ئامرازی مەبەست ( بەڵ )ە ، کە بەشێکی نادیارە و بێ واتایە • هەبوونی بەس بۆ دروستکردنی ئامرازی ئاوبراوە • بەوردبوونە لەم بەشە دەردەکەوێت لـە (بەڵام) یان ( بەڵان ) ەوە هاتبێت پاش کـەوتنی ( ام ) ، ( ان ) لە یەکەم و دووەمدا • ئەمەش بەڵگەی قەناعەتی راستی تەواو ناگەیەنێ •

**وەکـو :**

ئامرازێکی لێکدراوە لە دوو بەش پێکهاتووە لە بەشی ( وە ) و بەشی

( کو ) • ( وه ) ئامرازێکی پەیوەستدارە لە زمانی کوردیدا ـ دوایی قسـەی لەسەردەکەین ـ • ( کو ) ئامرازێکی گەیەنەری دیالێکتی کرمانجی سەرووە و بەشداری لە دروستبوونی ( بەڵکو ) کردووە ـ بڕوانە بەڵکو ـ • هەردوو ئامرازەکان ، ئامرازی لێکدراوی مەبەستیان دروست کردووە •

**بۆئـەوەی :**

ئەمەشیان لە ( بۆ ) و ( ئەوەی ) پێکهاتووە • ( بۆ ) ئامرازێکە بەکاردێت بۆ وە پاڵ نان • ( ئەوەی ) لە عاستی خۆیدا لە دوو بەش پێکهاتووە لە ( ئەوە ) و ( ی ) • ( ئەوە ) راناوی نیشاندەرە بۆ دوور ، بەڵام ( ی ) ئیزافەتە • لـە خۆیدا (بۆئەوەی) ئامرازی ( کە ) شی لەگەڵ بووە ، بەڵام ( کە ) لە ئامرازەکەدا نەماوە و ( ی ) ئیزافەتی تێدا ماوە ، کە ( کە ) ی بە ( ئەوە ) دەبەستەوە •

**کـەچی :**

ئەم ئامرازە لە ئامرازی گەیەنەر ( کە ) و راناوی نادیاری شت ( چی ) پێکهاتووە ( کە ) ئامرازێکی گەیەنەری زمانی کوردیە ـ بەدرێژی قسـەی لەسەر دەکەین ـ • ( چی ) راناوێکە نادیارە • هەروا دەشتوانێ ببێ بە ئامرازی پرسیار و رستەی پرسیاری دروست کات •

**چونکـه :**

ئەمەیان لە ( چون ) و ئامرازی گەیەنەر ( کە ) پێکهاتووە • بە وردبوونەوە لەبەشی یەکەمی ( چون ) دەردەکەوێت ، کە لە ( چۆن ) ەوە هاتووە ، کـــە ئامرازێکی پرسیارە لە پاشدان پیتی ( ۆ ) ی بووە بە ( و ) و ( چون ) دروست بووە • دیارە ـ چونکە زۆر باسمان کردووە ـ بەشی دووەمی ( چونکە ) ، کە ( کە ) یە ئامرازێکی گەیەنەرە و فرە بەکارهاتووە و زۆر بەشداری دروسـت بوونی ئامرازی لێکدراو دەکات هەروەش لێرەدا خۆی لەگەڵ ( چون ) لـە ( چونکە ) دا رێکخستووە و ئامرازی گەیەنەری ( چونکە ) دروستبووە •

**ئـەگـەر :**

ئەم ئامرازەش لەدوو بەش پێکهاتووە لە بەشی ( ئە ) و ( گەر ) ٠ بەڵگەش بۆ ئەوەی ، کە ئەمە ئامرازێکی لێکدراوە ئەوەیە کە ( گەر ) بەتەنها بەکـــار دێت و جاری واش هەیە ئامرازی نـەفی ( مە ) وەردەگرێت و ( مەگـــەر ) دروست دەکات پیتە قاڵبی ( ئە ) ش هـــەر وەك دێتــە پێش چاوو بۆ دووپاتی بەکاردێت ٠ هێزی ئەم ئامرازە بە پیتە قاڵبی ( ئە ) زیاترە لە وەی ، کە بە بێ ئەم پیتە قالبە ٠٠٠[1] بێت ٠ لە هەندێ گۆڤەرانی زمانی کوردیدا ( هەگەر )یش هەیە ٠ ئەمە وا دەگەیەنێ ، کە ( ئە ) جێگای ( هە ) س گرتۆتەوە ( هە ) ش لە ( هەر~ ) ەوە هاتووە وەك چۆن ( هەرکـــە ) هەیە ٠ بەڵام لێرەدا پیتی ( ر ) کەوتووە و ( هە ) ماوەتەوە ٠ هەر بەم پێیەش ( ئە ) لە ( ئەر ) ەوە هاتووە پاش کەوتنی پیتی ( ر ) ٠ هەندێ جار لـە دیالێکتی کرمانجی خوارووودا لە بریتی ( ئەگەر ) ( ئەر ) بە کار دەهێنرێت ٠ لەدیالێکتی کرمانجی سەروودا ( ئەر ) بە ( ئەگەر ) واتا دەگەیەنێ وەك ئەو بە بڵاوی بەکار دەهێنرێت ٠٠٠[2] ٠

## ــ ٤ ــ

## ئامراز لە رووی ئەرکەوە

ئامرازە سینتاکسیەکان ، کە لێرەدا باسیان دەکـــەین ، بە ئەرکێکی زۆر گرنگ هەڵدەستن ٠ ئەرکەکـە بریتیە لە پێکەوە بەستنەوەی دوو رستە یـــان

---

(١) مامۆستا تۆفیق وەهبی زاراوەی پیتە قاڵبی بۆ (ئە) بەکار هێناوە و وای ناوناوە ئێمەش هەر هەمـــان ناو بەباش دەزانین و بەکارمان هێنا لـــەم کارەدا بڕوانە کارەکـــەی ( تۆفیق وەهبی ئەسڵی پیتە قاڵبی « ئە » ی شێوەی سلێمانی ــ گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد بەرگی یەکەم ، بەشـی یەکەم ، ١٩٧٣ ل ، ٩ ) ٠

(٢) مامۆستا جگەر خوێن ئەمەی لەکتێبەکەیدا بەکار هێناوە بڕوانە ( جگـەر خوێن آوا ئو دەستورا زمانی کوردی ، بەغدا ١٩٦١ ، ل ، ١٠٠ ) ٠

گەیاندنی رستەیەك بە یەکێکی تر • جا بەپێی ئەم کارەی ، کـــە ئێمە لەبەر دەستمانە و تێدا باسی ئامرازە سینتاکسیەکان دەکەین ، دەکرێن بە دوو بەشەوە ، بەشی پێکەوە بەســـتنەوەی دوو رســتە ؛ ئەمــەیان پێی‌یان دەوترێت ئامرازی سینتاکسی پەیوەستدار • ئەوانەی رستەیەك دەگەیەننە رستەیـــەکی تر پێیان دەوترێت ئامرازی سینتاکسی گەیەنەر • هەر بەشـــە لەوانەدا ئامرازی خۆی هەیە و ئەرکی تایبەتی جێبەجێ دەکات •

کەواتە ئامرازەکانی سینتاکس لە رووی ئەرکـــەوە دەکرێن بـــە دوو بەشـــەوە :

**١ ـ ئامرازی سینتاکس پەیوەستدار •**
**٢ ـ ئامرازی سینتاکس گەیەنەر •**

بەشی سێەمو چوارەمی کارە سەبارەت هەریەکەیانە •

لەم بەشەدا باس زاراوەی ئامرازی پەیوەستدار و جۆرەکانی ئامرازی پەیوەستدار دەکەین •

## - ١ -

## زاراوەی ئامرازی سینتاکسی پەیوەستدار

لە کتێبەکانی ڕێزمانی کوردیدا زاراوەی تریش هەیە بەکار دەهێنرێت بە هەمان مەبەست هەروەك مامۆستا سەعید سدقی کابان زاراوەی عەتفی ( عطف ) بەکار هێناوە ••• [١] مامۆستا تۆفیق وەهبی ( لێکدەر ، بەندی ، یەك‌خەر ) ی بەکار بردووە ••• [٢] ، پرۆفیسۆر قەناتێ کوردۆ - ك• ك• کوردۆیێف - زاراوەی ( پەۆگرێك ) ی بەکار هێناوە ••• [٣] مامۆستا نوری عەلی ئەمین ( پی‌بەست )ی بەکار بردووە ••• [٤] ، مامۆستا ڕەشید کورد ( پێوەند ) ی بەکار هێناوە•••[٥]، مامۆستا جگەر خوێن تیپی پێوەند )[٦] ی بەکار هێناوە ، لێژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد زاراوەی ( عطف ) ی بەکار هێناوە •••[٧] •

---

(١) سەعید سدقی کابان مختصر صرف نحوی کوردی بەغدا ، ١٩٢٨ •
(٢) ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی - بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ، ٣٢٦
(٣) قەناتێ کوردۆ زمانێ کوردی - ڕێزمان - یەریڤان ، ١٩٧٠ ، ل ، ١٢١
(٤) نوری عەلی ئەمین ڕێزمانی کوردی ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ، ٢٠٣ •
(٥) ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی ، ١٩٧٦ ، ل ، ٣٢٧ •
(٦) جگەر خوێن آوا ئو دەستورا زمانێ کوردی ، بەغدا ، ١٩٦١ ، ل ، ١٩٨
(٧) لێژنەی زمان وزانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەغدا ، ١٩٧٦ •

ئێمە لەم کارەدا بە باش دەزانین ، کە زاراوەی پەیوەستدار بەکار بهێنین، چونکە ئەم ئامرازانە پەیوەستی لە نێوان دوو رستەدا پەیدا دەکەن ؛ بەمەوە توانای پەیوەستیان هەیە ؛ لەبەر ئەوە ناویان دەبەین بە ئامرازی پەیوەستدار • ووشەی پەیوەستدار لە دوو بەش پێکهاتووە لە بەشی ( پەیوەست ) و بەشی ( دار ) • پەیوەست بە واتای پەیوەندی بەکار دەهێنرێت • بەشی ( دار ) ئامرازێکە بۆ دروست ـ کردنی ناوی دارێژراو بەکار دەهێنرێت هەروەك : سەردار ، علمدار ، زامدار ، خەزنەدار ••• هتد • ئەم ئامرازە واتای هەبوون دەگەیەنێ ، کە ( دارد ) ی فارس دەگرێتەوە • واتای تێکڕای ئامرازەکە « ئامرازی پەیوەست هەبێ » • •

ئامرازەکانی پەیوەستدار لەزمانی کوردیدا ئەمانەن ئێستا ، وە ، بەڵام ، ش ، ئینجا ، و ، یا ئەگینا ، ئەوسا ، بەڵکو ، وەکو •

ـ ٢ ـ

## جۆرەکانی ئامرازی سینتاکسی پەیوەستدار

ئامرازەکانی سینتاکسی پەیوەستدار لە زمانی ئەدەبی ئیمرۆی کوردیدا دەکرێن بە چوار بەشەوە :

**١ ـ ئامرازی پەیوەستداری پێکەوە بەستنەوە •**

**٢ ـ ئامرازی پەیوەستداری عەتف •**

**٣ ـ ئامرازی پەیوەستداری لێك جیاکەرەوە •**

**٤ ـ ئامرازی پەیوەستداری هامبەری یەك •**

**(١) ئامرازی پەیوەستداری پێکەوە بەستنەوە :**

لەم زمانەدا دوو ئامرازی پەیوەستداری پێکەوە بەستنەوە هەن ، کە برتیین لە ئامرازەکانی : و ، ش •

## أ ـ ئامرازی پەیوەستداری پێکەوە بەستنەوەی « و » :

لێرەدا ئامرازی « و » ، کە ئامرازێکی هێجگار باوو بڵاوە و بەکار هاتووەو ئامرازێکی پەیوەستداریشـــە ؛ دوو رســـتەی سادە بەیەکـــەوە دەبەستێتەوە بەستنەوەیەکی تەواو ، بۆ نموونە :

**تۆ هەتە تیغی دەبان**
**و**
**من هەمە تیغی زبان**

فەرقی ئەم دوو تیغە هەروەك ئاسمان‌ورێسمان (پەند کەریم ، ل ـ ٣٩)

لەم رستەیەدا دیارە ، کە « و » هەر دوو رســـتە ســـادەکانی ( تۆ هەتە تیغی دەبان ) ، ( من هەمە تیغی زبان ) پێکەوە بەستوونەتەوە بەستنەوەیەکی تەواو ، لەم رستە لێکدراوە پەیوەستدارەدا دوو فاعیل هەیە لەگەڵ دوو فیعل ؛ یانی بۆ هەر رستەسادەیە فاعیل و فعلی خۆی هەیە . دەش بێ بۆ هەردوو رســـتەکە یەك فاعیل هەبێ و دوو فعل . بۆنموونە :

× **ئافرەتێکی سەرە دلی لەرزی**
**و**
**رەنگی زەرد هەلگەرا . (ك ژ . ت ، ل ـ ٤)**

× **تەماتە ماسی بگری**
**و**
**تەڕ نەبی**
**قومـــار بـــازیش بـــی**
**و**
**ئاخر شەڕ نەبی ( پەند ـ کەریم ، ل ـ ٤٧ )**

یان بەپێچەوانە لە رستە لێکدراوە پەیوەستدارەکەدا دو فاوعیل یەك هەیە .

بۆنموونە :

**ئەو ببێت بە کوڕی ئەم**
**و**
**ئەمیش بە باوکی ئەو .**
**( ك . ژ . ت . ل ـ ٩٥ )**

لەم رستەیەدا ، کە رستەیەکی لێکدراوی پەیوەستدارە ، فعل لە رستەی سادەی دووەمدا نیە ، کە دەبووایە (بێت) بێ • هەروەك دەبوو رستە سادەکە ( ئەمیش بێت بە باوکی ئەو ) لێرەدا فرمانی ( بێت ) نیە ، کە فعلی رەستەکەیە و ماوەتە ( ئەمیش بە باوکی ئەو ) •

سەبارەت کاتی فعلەکانی ئەم رستانەوە ، کە بە یارمەتی ئامرازی « و » ی پەیوەستدار بەیەکەوە دەلکێن دەبینین ، کە لە رستەکاندا دیارە ، فرمانی هەردوو رستەکان دەبێ لەیەك کاتدا بن و لەگەڵ یەك بگونجێن ، لەرستەی لێکدراوی پەیوەستداری یەکەم فرمانی هەردوو رستەکان لەیەك کاتدان ، کە هەردووکیان کاتی ئێستان ( هەتە ، هەمە ) ، کە لە چاووگی ( هەبوونەوە ) هاتوون • هەروا لە رستەی لێکدراوی دووەمیشدا فرمانی هەردوو رستەکان لەکاتی رابردوو دان ( هەڵگەڕا ، لەرزی ) •

لە رستەی لێکدراوی پەیوەستداری سێیەمیشدا کاتی فرمانی دێڕی یەکەم لە نموونەکەدا لە کاتی ئێستا دان ، فرمانی رستەی یەکەم موسبەتە و هی دووەم نەفییە •

ئامرازی پەیوەستداری « و » دەتوانێ دوو ووشە پێکەوە ببەستێتەوە • بۆنموونە :

**× خەیاڵی ئاش [ و ] ئاشەوان جوێیە**

**هیچیان نازانن دانیان لە کوێیە ( پەند ـ کەریم ، ل ـ ٤٠ )**

**× پارەی بەخشندە [ و ] ئاوی ناو بێژەنگ**

**وەك پشکۆیە ، کە بکرێتە ناو چنگ ( پەند ـ کەریم ، ل ـ ٤١ )**

**ب ـ ئامرازی پەیوەستداری پێکەوە بەستنەوەی « ش »**

ئەم ئامرازە دەتوانێ بە تەواوی دوو رستە بەیەکەوە ببەستێتەوە بۆنموونە :

**من عەیشانم خۆش ئەوێ ، ئەوی**
**ش**
**منی خۆش ئەوێ ٠**
**( ئە٠ ك٠ ل ــ ٤٠ )**

ئامرازی « ش » لێرەدا رستەی ( من عەیشانم خوش ئەوێ ) ، ( ئەو منی خۆش ئەوێ ) بەیەکەوەی بەستوونەتەوە ٠ لەم رستە لێکدراوە پەیوەستدارەدا هەر رستەیە فاعل و فعلی تایبەتی خۆی هەیە ٠ مەرجە لێرەدا یانی بە یارمەتی ( ش ) رستەکان هەریەکە فاعلی خۆی هەبێت ٠ بۆنموونە :

**ئەویان بە کولنگ ئەرزی ئەکۆلی ، منیـ**
**ش**
**بە خاکەناز خۆلەکەیم دەر ئەدا ٠ ( ئە٠ ك٠ ل ــ ٨ )**

لەم رستە لێکدراوە پەیوەستدارەدا بۆ هەر رستەیە فاعلی تایبەتی هەیە ، رستەی یەکەم ووشەیُ « ئەویان » ، کە راناوی جودای کەسی سێیەمی تاکــە فاعلی رستەکەیە ٠ لە هی دووەمدا ووشەی « من » ، کە راناوی جودای کەسی یەکەمی تاکە فاعلی رستەکەیە ٠

هەروا لەم رستە لێکدارانەی ، کە ئامرازی پەیوەستدار « ش » وەزیفە دەبینێ فعلی رستەکانە لەرووی کاتەوە خاسیەتی تایبەتی خۆیان هەیە ، وەك بە زۆری فرمانی هەردوو رستەکان لە یەك کاتدا دەبن ٠

بۆنموونە :

**هەندێ ئامۆژگاری ئەڵەمان کوردیان کرد ، ئەویـ**
**ش**
**بە سەر بادانەوە لە خەڵکەکە جیابووەوە ٠**
**( ئە٠ ك٠ ــل ، ١٢ )**

لەم رستەیەدا فرمانەکانی ( ئامۆژگاری‌کرد ) و ( جیابووەوە ) ، کە هی رستەی یەکەم و دووەمن لەیەك کاتدان ، هەر دووکیان لەکاتی رابردوو دان ٠ هەروا هەردووکیان دەتوانن لەکاتی ئێستادا بن ٠ بۆنموونە :

**خەلكی خۆیان لە ئەمن غردەنبەوە ، ئەمنیـ**
**ش**
**قسەی راستیان لۆدەکەم .**

**( ئە. ک. ل ــ ١٥ )**

جاری وا دەبێ ، کە کاتی فرمانی رستەکان رابردوو بێ هەر یەکە جۆرە رابردووێکە هەر وەك لەم رستەی خوارەوەدا دیارە . بۆنموونە :

**ئەو چاوەڕوانی دەمی منی ئەکرد ، منیـ**
**ش**
**چاوەڕوانی وتەیەکی کاریگەری تەڕوبڕ بووم .**

**( ك. ژ. ت. ل ــ ٨٢ )**

لەم رستە لێکدراوە پەیوەستدارەدا رستەی یەکەم فرمانێکی کاتی رابردووی بەردەوامە ووشەی « ئەکرد » ، فرمانی رستەی دووەم فرمانێکی کاتی رابردووی دوورە ووشەی ( چاوەروان‌بووم ) .

مەرج نیە لەرستە لێکدراوە پەیوەستدارەکاندا یان لە هەموو رستەکانی تردا پیتی « ش » هەبێ وەك ئامرازی پەیوەستدار ، بەڵکو ئـەم پیتە دەتوانێ ئەرکی ئامرازی دوو بارە کردنەوەش جێبەجێ بکات ، کە جێگای « ایضا » ی عەرەبی بگرێتەوە . بۆنموونە :

ئەو ئەچێ بۆ ماڵەوە ، ئەبێ منی[ش] بچم بۆماڵەوە .

« ش » لێرەدا ئامرازە بۆ دووبارەکردنـــەوە بەکار دەهێنرێت و لـــەم رستیەدا بۆ ئەمە بەکار هاتووە .

**(٢) ئامرازی پەیوەستداری عەتف :**

لێرەدا هەر ئامرازی « بەڵام » هەیە ، کە دەتوانێ رۆلی عەتف بگەیەنێ ، ئـــەم جۆرە بۆ زۆر ئامراز ناوبراوە ، کـــە هەمـــوو ئامرازەکانی پەیوەستدار

دەگرێتەوە • ئەم جۆرە لە ڕێزمـــانی کوردیـــدا زۆر بەرچاوو دەکەوێ لـە قسەکردن و نووسیندا • بۆنموونە :

**لێرەدا ویستی بدوێ ،**
**بەڵام**
**هەرچی لە سەریا بوو لەناکاو فڕی •**
**( خ• ئا• ــ ل ــ ٧ )**

ڕستەی لێکدراوی پەیوەستدار بە یارمەتی ئامرازی پەیوەستداری عەتف « بەڵام » دەبێ لە دوو موبتەدا یان فاعیل پێکهاتبێ ، ئەمــەش بەزۆری بەرچاوو دەکەوێت • بۆنموونە :

**دەمم هەڵا هێنایەوە وەرام بدەمەوە ،**
**بەڵام**
**تەپە تەپی پێی وەستاو وەستاژنم دەم کوتی کردم •**
**(ك• ژ• ت• ل ــ ٨٣ )**

لەم ڕســـتە لێکدراوە پەیوەســـتدارەدا فاعیلی ڕســـــتەی یەکـــــەم ( م ) ە ، کە ڕاناوی لکاوی کەسی یەکەمی تاکە ، فاعیلی ڕســـــتەی دووەم کۆمەڵە فاعیلی ( تەپە تەپی پێی وەستاو وەستا ژنم ) •

× **شۆخی جوانی بەد ڕەوشت**
**وەك ژاڵە ئاڵــە تاڵــە**
**بەڵام**
**یاری خۆش سروشت**
**کانگەی کەماڵــە ، ماڵــە**

× **من بێ دەنگ بووم و هیچ قسەیەکی ترم پێ نەکرا ،**
**بەڵام**
**ئەو کاتێك چاووی لە قووڵایی ئاسمان داگرتەوە و**
**لای دانە سەر ڕوخساری من • ( ك• ژ• ت• ل ــ ٥١)**

سەبارەت فرمانی ڕستەی لێکدراوە پەیوەستدارەکان بەیارمەتی ئامرازی « بەڵام » ئەوەیە ، کە فرمانەکانی ڕستەکان دەشێن هەردووکیان لە یـــەك

کاتدا بن یان لە کاتی لێك جیا • جاری وا هەیە هەردووکیـــان لە کاتـــی رابردوون • بۆنموونە :

**هێشتا منال بووم ، کە دایك و باوکمان فەرمایشتی خوایان بەجێ هێنا ،**
**بەلام**
**براکانم برا بوون ، لێم بێزار نەبوون و بەدەستمەوە وەڕس نەبوون •**

**(ك• ژ• ت• ل ـ ١٠٨)**

هەروا کاتە رابردووەکانیان لێك جیابن • بۆنموونە :

**ئافتاویش وەك هەموو رۆژانی پیالەکانی ئامادەکرد ،**
**بەلام**
**بۆچی بەتایبەتی یەکێکیانی لەوەکانی تر باشتر ئەشت**

**( ك• ژ• ت• ل ـ ٧٦ )**

فرمانی رستەی یەکەم « ئامادەکرد » فرمانێکی رابردووی سادەیـــە • فرمانی رستەی دووەم (ئەشـــت) فرمانێکی رابـــردووی بەردەوامـــە • دەشبێ ، کە فرمانەکانی رستەکان لەکاتی جیا دابن • بۆنموونە :

**راستە ، خوا زەلیلی کردووم ،**
**بەلام**
**ئەتوانم ، خۆم بژیەنم •**

**( ك• ژ• ت• ل ـ ١٠٨ )**

فرمانی رستەی یەکەم « کردووە » رابردووی پێرفێکتە ( تەواو ) فرمانی رستەی دووەم کاتی ئێستایە « ئەتوانم » •

ئەشزانم ، کـە ئێمە ئەمڕۆ وەك زۆربـەی رۆژانی تر ، لە گۆشـــتی **چەور و چەوریمان نەبووە ،**
**بەلام**
**هەر قایلم • ( ك• ژ• ت• ل ـ ٦٤ )**

فرمانی رستەی یەکەم « نەبوو » رابردووی نەفیە ، فرمانی رســـتەی دووەم کاتی ئێستایە « قایلم » •

**(٣)  ئامرازی پەیوەستداری جیاکەرەوە**

ئەمەشیان لە زمانی کوردیدا هەر ئامرازی « یا » بەکار دەهێنرێت • هەندێ جار بە « یان » بەدیار دەکەوێ • نموونە بۆ ئامرازی « یا » :

**چەندێ خەریکی ئاوگڵ ئەبۆین**
**یـا**
**بەسەر بادا ئەهاتین ئەچوین**
**قسە هەزارە هەر دوێ بەکارە**
**وەکو ئاو هاتین وەکو ( با ) ئەرۆین ( پەند ـ کەریم ، ل ـ ١٠٨ )**

لەم رستە لێکدراوە پەیوەستدارەدا ئامرازی ( یا ) توانیویەتی رستە سادەکانی ( چەندێ خەریکی ئاوگڵ ئەبوین ) ، ( بەسەر بادا ئەهاتین ئەچوین ) بەیەکەوە ببەستێتەوە • ئامراز لێرەدا لەرووی واتا واتایەکی جیاکردنەوە دەدات بەدەستەوە • هەروا لە رستەکەدا دیارە ، کە زۆربەی ئەم جۆرە رستانە بە یارمەتی ( یا ) یەك موتبەدای هەیە •

ئەم ئامرازە دەتوانێ دوو ووشە یان دوو کۆمەڵە ووشە بەیەکەوە ببەستێتەوە لە ناو رستەیەکی سادەدا • بۆنموونە ٠

**تۆ بەخێو ناکەم بۆ خەو و خواردن**
**[ یا ] وەك هەندێ کەسی بۆ چاوشۆڕکردن**
**کوڕم نەتبیستوە مەشورتر لە گشت**
**سەر بۆ سەر بڕین نەك بۆ سەرزەنشت ( پەند ـ کەریم )**

ئامرازی « یا » ی ئێرە کۆمەڵە ووشەی « بۆ خەو و خواردن »ی بەکۆمەڵە ووشەی « وەك هەندێ کەس بۆ چاو شۆڕکردن » بەستۆتەوە •

**(٤)  ئامرازی پەیوەستداری هامبەری**

لێرەدا ئامرازی ئەوسا خۆی خستۆتە ئەم قەوارە ، وە بە واتای هامبەری بەکار دێت • دەوری ئامرازی « ئەوسا » ، لە بەیەکەوە بەستنەوەی دوو رستە زۆرە • بۆنموونە :

**پشویەکم دا ،**
**ئەوسا**
**روانیمە دەور و پشتم ۰ ( خ۰ ئا۰ ل ـ ۳۷ )**

لەم رستەیەدا ئامرازی « ئەوسا » توانیوویەتی ، کە هەردوو رستەکانی ( پشویەکم دا ) ، ( روانیمە دەور و پشتم ) بەیەکەوە ببەستێتەوە ئەم رستانە یەك موتبەدایان هەیە و دوو خەبەر ، کە فرمانـــەکانیان لەکاتی رابردوون • بۆنموونە :

**سەری راوەشان ، وەکو جارێکی تر بەخێر هاتنم بکات ،**
**ئەوسا**
**کەوتە چاوگێران وەکـــو بیەوێ یەکێـــك ببینێ ۰**
**(خ۰ ئا۰ ل ـ ٤۱ )**

لەم رستە لێکدراوە پەیوەستدارەدا ئامرازی « ئەوسا »ی پەیوەســـتدار واتای « ئەوکات » دەگەیەنێ • لە زمانی کوردیدا زۆر جار ووشەی « کات » « سات » دەگرێتەوە ؛ کەواتە « سات » « کات » • ، بەڵام پیتی « ت » لـــە « ســـات »دا نـــەماوە و رۆژگـــاری گفتوگۆ و نووسین خســـتوویەتی و ماوەتەوە « سا » •

گەلی جاری واش هەیە ، لە برێتی « ئەوسا » « ئەوجا » دروست دەبێ و بەکار دەهێنرێت • بۆنموونە :

**کەینێ گلێ حوشترێ بگاتـــە عـــەردێ ،**
**ئەوجا**
**ئەتووش دەبیە ئەفەنـــدی ۰ ( ئە۰ ك۰ ل ـ ۱۰۳ )**

لێرەدا « ئەوجا » لە برێتی ئامرازی « ئەوســا » بـــەکارهاتـــووە و دوو رستەی بەیەکەوە بەستوونەتەوە • « ئەوجا » لە « ئەو » و « جار » پێکهاتووە • ووشەی « جا » یانی « کات ـ سات » ، بەڵام لێرەدا پیتی « ر » کەوتووە ، هەر چۆن پیتی « ت » لە « سات » ەوە کەوتبوو • لەوێشدا ماوەتەوە « جا » بە واتای « جار » و « ئەوجا » دروست بووە •

هەندێ ئامرازی تری سینتاکس پەیوەستدار هـــەن ، ناچنە پاڵ ئـەو بەشانەی سەرەوە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئامرازی سنیتاکس پەیوەستدارن ، کە یەکە یەکە باسیان دەکەین :

**ئامرازی پەیوەستداری « یا ••• یا »**

**ئەم ئامرازە یەکێکە لە ئامرازەکـــانی سنیاکسی پەیوەستدار ، کـە دوو رستە بەیەکەوە دەبەســـتێتەوە و واتــای هەڵبژاردن دەگەیەنێ « اختیار » ، بۆنموونـــە :**

ڕێگەیەکی تر بدۆزمەوە بۆنان پەیداکردن یا کۆڵ هەڵگری
یا کرێکاریش بێت • (ك• ژ• ت• ل ـ ٦٩ )

لەم رستە لێکدراوە پەیوەستدارەدا ئامرازی « یا ••• یا » بەکارهاتووە ، کە توانیوویەتی رستەی « کۆڵ هەڵگری » ، کە رستەیەکی بێخەبەرە بـــە رستەی « کریکاریش بێت » ببەستێتـــەوە • خەبـــەری رستەی یەکـــەم لـــە رستەلێکدراوە پەیوەستدارەکەدا هەمان خەبەری رستەی دووەمە •

هەندی جاری تر واتای ئیحتیمال دەگەیەنێ • بۆنموونە :

**گوللە پارچە قورِشمێکە و لە شێوەی ناوکە خورمایەکدایە •••**
**لە لوولەیەکی باریکەوە دەرئەپەڕێت یا ئەی گرێ یا نای گرێ •**
**( ك• ژ• ت• ل ـ ٧٢ )**

لەم رستەیەدا یەك موتیەدا هەیە و دوو خەبەر ، خەبەری رستەی یەکەم موسبەتە ، بـــەڵام خەبـــەری رســـتەی دووەم نەفیە بە یارمـــەتی ئامرازی « نا » ی نەفی •

**ئامرازی پەیوەستداری « بەڵکو »**

« **بەڵکو ئامرازێکی بەکار هات و بلاوە لە زمانی ئەدەبی ئیمرۆی کوردیدا •**

هەروا زۆر بەکاردەهێنرێت بۆ بەیەکـەوە بەستنەوەی دوو رستەی سادە • بۆنموونە :

**من قوتابخانەی شارەکەمانم تەواو کرد ، لەزانستگای بەغداش دەرچووم ،**
**بەوەش نەوەستام ،**
**بەڵکو**
**کۆتاییم بە زانستگایەکی ئەورووپاش هێنا .**
**( ئە. ک. ل ـ ١٠٤ )**

لەم رستە لێکدراوە پەیوەستدارەدا ، کە بە یارمەتی ئامرازی « بەڵکو » بەیەکەوە بەستراونەتەوە یەك موتبەدا ـ فاعیل ـ هەیە . جاری واش دەبێ بۆ هەر رستە سادەیە موبتەدای تایبەت هەیە . بۆنموونە :

**ئەیویست ، بۆ یەکەم جار داخی دڵی بۆ شلە شاری‌یە بگێڕێتەوە ،**
**بەڵکو**
**ئەمە خوایە ئەو باسە بچێتە سەر زبان و لێوێك .**
**( خ. ئا. ل ـ ٤١ )**

لەم رستە لێکدراوە پەیوەستدارەدا ، هەر رستە سادەیە موتبەدای تایبەتی خۆی‌هەیە ، موتبەدای رستەی یەکەم فاعیلێکی نادیارە بۆ کەسی سێیەمی تاك « ی » ، کە بەفرمانی « ئەیویست » ەوە لکاوە ، بەڵام موبتەدا لە رستەی دووەمدا ووشەی « باس » ە .

جاری وایە دەبێ لە رستەی یەکەمدا راناوێك یان ناوێك هەبێت بۆ پەیداکردنی نسبەت لە نێوان هەردوو رستە سادەکاندا تا بتوانێ بە ئامرازی « بەڵکو » کاری خۆی بکات . ئەمە وا دەگەیەنێ ، کە گەلێ جار « بەڵکو » کاری خۆی دەکات بە هەبوونی ئەم جۆرە ناوە تەنا سوبیانە ناوە تەناسوبیەکان بەزۆری دەربڕینی یان ووشەی « تەنیا ، نەوەکو » نە . بۆ نموونە :

**× قارەمانی چیرۆکەکەم تەنیا ئایشەخان بوو ،**
**بەڵکو**
**دلاوەریش بوو .**
**( ئە. ک. ل ـ ١٤١ )**

× **دەنگو باسی دۆزینەوەی ئەم گەنجینەیە نەوەکو تەنیا لەگەڕەکی ئێمەدا بڵاوبووەوە ،**
**بەڵکو**
**بەر گوێی هەموو دانیشتووانی شار کەوت • (ئە• کێ• ل-۸۸)**

لێرە تێبینی دەکرێت ، کــە بەکار هێنانی ناوی تــەناسووبی « تــەنیا » لەرستەی یەکەمدا دەبێ فرمانی هەمان رستە لە حاڵەتی نەفیدا بێت ، بــەڵام گەر ناوی تەناسوبی « نەوەکو » بوو دەبێ فرمانی رستەی یەکــەم لەحاڵەتی نەفیدا بێت ، بەڵام گەر ناوی تەناسوبی « نەوەکو » بوو دەبێ فرمانی رستەی یەکەم لەحاڵەتی موسبەتدا بێت •

فرمانی هەردوو رستەکان دەبێ لەیەك کاتدا بن • بۆنموونە :

**لە راستیدا کابرا ئەم ووشەیەی تەنیا بەئێمە نەووت ،**
**بەڵکو**
**هەموو کوڕەکانی ئەوناوە گوێیان لێبوو • (ئە• ك• ل-۹)**

هەندێ جاریش وا رێکدەکەوێت ، کە فرمانی یەکەم فرمانی داخوازی و هی دووەم کاتی ئێستایە • بۆنموونە :

**دڵ لەمیحنەت کەیلە ،**
**بەڵکو**
**زوو دەرچم لەشار**
ئیمڕۆ رۆژێکە لە جەمعی مەردۆمانبگرم کەناو (بەند -کەریم• ل-۸۵)

**ئامرازی پەیوەستداری «وەکو»**

« وەکو » یەکێکە لەو ئامرازانەی ، کە دوو رســـتەی سادە بەیەکەوە دەبەستێتەوە • بۆنموونە :

**ئاغاش بێ ووچان ئاوری ئەدایەوە بۆی ئەخنایەوە ،**
**وەکو**
**بیەوێ دڵ نەوایی بکا • ( خ• ئا• ل - ۱۹ )**

ئامرازی « وەکو » وەنەبێ هەر تەنها دوو رستە بەیەکەوە ببەستێتەوە بەڵکو سەرەڕای ئەوەش دەتوانێ بەکار بهێنرێ وەك ئامرازی « وەك یەك » ، ئەمەش لەروانیێژی کوردیدا زۆر باش بەکار دەهێنرێ . بۆنموونە :

**لەو رۆژە هەستم کرد ، شتێك لەگیانما ئەبزوێت ،**
**وەکو**
**منالی لەدایك نەبوو ئەیەوێت بێتە دەرەوە ( خ. ئا. ل-٤٣)**

ئامرازی « وەکو » ی یەکەم ئەرکی هەر تەنها لە بەیەکەوە بەستنەوەی دوو رستەیە ، بەڵام هی دووەم سەرەڕای ئەم ئەرکەی هەر بۆ وەك یەکە و وەك یەکی پیشان دەدات . لەبەر ئەوە لە نێوان ئەم هەردوو ئامرازانەدا کورتە جیاوازیەك هەیە . ئامرازی یەکەم لە هی دووەم زۆرتر دەچێتە پاڵ قەوارەی سینتاکسەوە .

ئامرازی « وەکو » جاری واهەیە ، کە ئامرازی نەفی « نە » وەردەگرێت . بۆنموونە :

**شارەکەی ئێمەش خۆی ئامادە ئەکرد ،**
**نەوەکو**
**رۆژێ لە رۆژان جەنگ بکەوێتە لای ئێمەشەوە .**

**(ئە. ک. ل-٦ )**

نموونەی بەکارهێنانی ئامرازی « وەکو » زۆرن هەروەك لـــە خوارەوە دیارن :

**ئەم دەم و لەچەم نی‌یە ،**
**وەکو**
**شارستانیەکان بپارێمەوە . ( ئە. ک. ل-٤٤ )**

**هەر ئەمەی ووت ،**
**وەکو**
**گرێی زبانی کرابێتەوە ، یان تینێکی نوری رزابێتـە دەماریەوە . ( خ. ئا. ل-٤١ )**

**ئامرازی پەیوەستدار « ئینجا »**

ئامرازی پەیوەستداری « ئینجا » یەکێکە لە ئامرازەکانی زۆر بەکارهاتوو • بۆنموونە :

**ئیتر گۆپانەکەی لەشانی داماڵی و بە کەمتەرخەمی‌یەکەوە ، هاویشتی‌یە سووچیکی عەلافخانەکەوە ،**
**ئینجا**
**کەوتە خوتەکاندن لەو تۆز و خۆڵەی لەسەر جلکەکانی کەڵەکە بووبوون •**

**( ك• ژ• ت• ل-٦٠ )**

ئامرازی « ئینجا » سەرەڕای پێکەوە بەستنەوەی دوو رستەی سادە بەیەکەوە واتای « لەپاشان » یش دەگەیەنێ • بۆنموونە :

**دیارە سەرخەوێکی بۆ ئەشکێنین ،**
**ئینجا**
**لە خەو هەڵئەسن و میوە ئەخۆن**
**( ئە• ك• ل - ٢٥ )**

نموونەکان پیشان دەدەن ، کە لە هەردوو رستەکانی ئێرەدا دەبێ یەك موتیەدا « فاعل » هەبێ • بۆنموونە :

**چاوی کردەوە کەمێك تێی روانیم ،**
**ئینجا**
**ووتی : ئاخ خۆزگە پارچە زەویەکی خۆمم ئەبو • (خ•ئا•ل-٤٤)**

لەم رستەیەدا فاعل راناوی کەسی سێیەمی تاکە و بۆ هەردوو رستەکان بەکار هاتووە • هەروا نموونەکان ئەوەش پیشان دەدەن ، کە دەبێ فرمانی هەردوو رستەکان لەیەك کاتدا بن • لێرەدا بە زۆری لە کاتی رابردوو دەبن •

بۆنموونە :

دوو سێ‌جار ئەم لاو ئەولای ژوورەکەی **کرد** ، جگەرەیەکی **داگیرساند** ،
**ئینجا**
**بەتوڕەیی‌یەوە ووتی : سووتاندم ؛ لەناوم برد • ( ئە• ك• ل-١١٨ )**

**ئامرازی پەیوەستداری « ئەگینا »**

ئەمەشیان لە ئامرازە پەیوەستدارەکانە و زۆر بەکار دێت • بۆنموونە :

× **بەس خوابکا منالە کانمان فێری کفر و زەندەقە نەکەن ،**
**ئەگینا**
**چاکە ئەبێتە خراپە • ( خ• ئا• ل–١٨ )**

× **دەرۆیش کاکەڵلا پیاوێکی خواناســە ، لەراستیدا هاتنی شاری تەنیا بۆ ئەوەیە نوێژی جومعەی لێ بکا ،**
**ئەگینا**
**بۆ بازاڕ و شتومەك کڕین حەمەد مستەفای کوری هەموو هەفتەیێــك دێ بۆ شار • ( ئە• ك• ل–٢٢،٣٤)**

ئەو رستانەی ، کە بەیارمەتی ئامرازی « ئەگینا » بەیەکەوە دەبەسترێنەوە ، دەبێ بۆ هەر یەکە موبتەدای تایبەتی هەبێ • بۆنموونە :

× **قوربان تۆ باسی ئەم نوێژەت هێنایە ناوەوە ،**
**ئەگینا**
**نەمن نەتۆ هیچ کامێکمان نەچووین بۆ نوێژ •**
**( ئە• ك• ل–٦٦ )**

× **وا دیارە ئیشی چاك قەت لە تۆوە ناوەشێتەوە ،**
**ئەگینا**
**چۆن بەم ئاسانی‌یە لە داخستنی قوتابخانەیەك ئەدوێــت •**
**( خ• ئا• ل–٢٨ )**

لەم هەردوو رستانەی سەرەوەدا لە هەر رستەیەدا دوو موتیەدا هەیــە : لە رستەی یەکەمدا موبتەداکان ووشـــەکانی « تۆ ، نــەمن نەتۆ » موبتەدان ، وە لە هی دووەمدا ووشەی « ئیشی چاك »و راناوی لکاوی کـــەسی دووەمی تاك ، کە لەفرمانی « ئەدوێت » دا دیارە •

**ئامرازی پەیوەستداری «وە» •••**(١)

« وە » ئامرازێکی پەیوەستدارە و لە زمانی ئەدەبی ئیمرۆی کوردیـدا بەرچاوو دەکەوێ • بۆنموونە :

---

(١) بڕوانە لاپەڕەکانی « ١٨ ، ١٩ »ی ئەم کارە •

× ئەمە یەکەمین جار بوو ، کە حاجی برایمم ئەدی ،
وە
دوا جارم بوو ، کە هێلکە لە داپیرە ئایشـــێ کــــــری ۰
( ئە۰ ک۰ ل-٨٦)

× کابرا شێتۆکەیە ، بەساویلکەیی ئـــەم کردەوانە ئەکا و هیچیشی لەبارا نی‌یە ،
وە
ناتوانێ کار لەخەڵکی بکا ۰ (ئە۰ ک۰ ل-٥ )

× ئەڵلا بەرەکەت یاخوا هەموو رۆژێ کوێخا کەریم کوڕی بێ ،
وە
کوێخا رەحیمیش کچ ۰ ( ئە۰ ک۰ ل-٢٩ )

× کوێخا کەریم بڕیاری لەسەر هەموو شتێك ئەدا ،
وە
هەمین و ئەستیش وەکو دوو خوشکی ژنی ئـــەم دوو برایە تێکەڵی هیچ کەین و بەینێك نەئەبوون ۰ (ئە۰ک۰ ل-٣٠ )

**ئامرازی پەیوەستداری « ئێستا »**

ئەمەیان هێجگار زۆر کـــەم بەکار هاتووە لـــە زمانی ئەدەبی ئیمڕۆی کوردیدا ۰ سەرەڕای واتای خۆی واتای کاتیش دەگەیەنێ ۰ بۆنموونە :

ئەو مام قیتەڵە لە سەرەتادا چەند رقی لە منالە بوو ،

ئێستا
سەد و بگرە هەزار ئەوەندە خۆشی ئەوێ ۰
( ک۰ ژ۰ ت۰ ل-٩٥)

رستەی لێکدراوی پەیوەستدار ، جاری وا هەیە دروست دەبێ بە بێ هەبوونی ئامرازی پەیوەستدار لێرەدا تەنها بە کۆما (فاریزە) « ، » بەیەکەوە دەبەسترێنەوە ۰ بۆنموونە :

قسەی کورت درێژمەکە
،
ڕێگەی نزیك دورمەکە ۰ (پەند۰کەریم۰ل-١٠٨)

ئەم جۆرە رستانە دەبن یەك موبتەدا بن و دوو موبتەدایی بن • بۆنموونە

**ئەچمە شارێ کەس نەمناسێ**

**خۆم هەڵئەکێشم پڕ بە کراسێ •**

**(پەند• کەریم• ل-٤٣)**

لەم رستەیەدا فاعیل راناوی لکاوی کەسی یەکەمی تاکە «م» کە بەفرمانی « ئەبەمم » و « هەڵئەکێشم » ەوە لکاوە •

**باران بباریٚ ئاشم ئەگەڕێ**

**باران نەبارێ جوتـــــم ئەگەڕێ •**

**(پەند• کەریم• ل-٤٩)**

لەم رستەیەدا دوو موبتەدا هەیە ، موبتـەدای رســـتەی یەکەم ووشەی « ئاش » ە و هی دووەم ووشەی « جوت » •

فرمانی رستەکان بە زۆرعی لەیـــەك کاتدا دەبن چ هـــەردووکیـــان لەکاتی ئێستا دەبن یان لەکاتی رابردوو • بۆ نموونە :

**بە خالو هات بەلامەوە**

**بو بە هەژدیها دای بە پامەوە •**

**(پەند• کەریم• ل-٥٤)**

فرمانی رســـتەی یەکـــەم « هات » کاتی رابردووە و فرمانی دووەم « دا » کاتی رابردووە •

**دۆست ئەوەیە ئەمگریەنێ**

**دوژمن ئەوەیە ئەمکە نینێ • (پەند• کەریم)**

هەردوو فرمانەکان لەکاتی ئێستادا وەك « ئەمگریەنێ » و « ئەمکەنینێ » •

لەم بەشەدا ، کە بەشی چوارەمی کارەکەیـــە باسی زاراوەی ئامرازی سینتاکسی گەیەنەر و جۆرەکانی ئامرازی سینتاکسی گەیەنەر دەکەین •

ـ ١ ـ

## زاراوەی ئامرازی سینتاکسی گەیەنەر

زاراوەی گەیەنەر لە بەشی « گەیەن » و ئامرازی « ەر » پێکهاتووە • ئەمە لە رووی دروستبوونەوە وایە • لە لایەن رێزمـان نووسانی کوردەوە ئەم زاراوەیـــە بەکار نەهاتووە لـە لای مامۆســـتا حەســـەن ئەحمـــەد حەسەنەوە ••••[١] بەکارهاتووە • مامۆستای بـەرێز ئامرازەکان بـە ئامراز ناو نابات ، بەڵکو ناویان بەراناو دەبات هەرچەندە راناو نین و ئامرازن •••[٢]، بەڵام ئێمە وا بەباش دەزانین ، کـــە زاراوەی « گەیەنـەر » بەکار بهێنین ، چونکە ئەم زاراوەیە لە هەموو زاراوە بەکار هاتووەکانی‌تر جێگیرترە •

ئەم زاراوەیە لـــە چاووگی « گەیاندن » ەوە هاتووە • بە مەبەسـتی گەیاندنی شتێك بە شتێکی ترەوە ؛ وەك گەیاندنی رستەیەك بەرستەیەکی تر یان بە واتایەکی تر وەك گەیاندنی رستەی شوێن کەوتوو بەرستەی سەرەکی لە نێو رستەی لێکدراوی شوێن کەوتوو خوازدا •

---

(١) ئەحمەد حەسەن ئەحمەد : رێزمانی کوردی ، بەرگی یەکەم ، چاپی یەکەم بەغدا ١٩٧٦ ، ل ، ١٧٢ •

(٢) د• ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم : رستەی لێکدراوی شوێن کەوتووخـــواز لەگەڵ رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری لـــە دیالێکیە ناوەندیەکانی زمانی کوردیدا، مۆسکۆ، ١٩٧٥ نامەی دکتۆرا ـ یان دەستەنـــووس بەزمانی کوردی ـ •

## - ٢ -

# جۆرەکانی ئامرازی سینتاکسی گەیەنەر

لە زمانی ئەدەبی ئیمرۆی کوردیدا ئامرازی گەیەنەر چەند جۆرێکـــی هەیە ، ئەمانەش وەك هێنەکانی خوارەوەن :

« کە ، بۆئەوەی ، کەچی ، تا ، چونکە ، ئەگەر ، بۆیە » .

**ئامرازی گەیەنەر « کە »**

ئامرازی گەیەنەر « کە » لە رووی ئیتیمولۆژیەوە دەگەڕێتە ســـەر بناغەی پرسیارداری « کا » ، « کە » ، « کێ = nto » ی فارسی کۆن . لە راستیدا ئەم ئامرازە دەگەڕێتەوە سەر فۆڕمی راناوی خۆیی حاڵەتی کراو « مەفعولی » ی « کەهیە » کە لە ئاڤێستادا « کەهیا » دەگرێتەوە هەر ئەویشە ، کە زۆر بە باشی بەکار دەهێنرێت . هەروا دەگەڕێتـــەوە سەر بناغەی بنجی راناوی نادیاری « کەشجی » ، « هەرکەس » ، « کەسێك » . ئەمانەی ، کـــە لێکۆڵینەوە دەکەن ، گەیشتوونەتە ئەوە ، کە ئەم ئامرازە لە زمانی فارســـی کۆندا وەکو راناوی کەسی بووە و بەکاریان دەبرد بەناوی « نوڤام » ئەمـــەش وەك دەربڕینێکی بچووکراو بەخشە دەکەوێتە پێشی بۆ تەواوکردنی واتاکەی و فراوان کردنەوەی . لە فارسی کۆندا « کە » وەك راناوی نسبەتدار بەکـــار نەهاتووە ، بەڵام هـــەر لای زانایانی زمان دیار دەکـــەوێ ، کە ئەم ئامرازە پرسیارە نادیارە و نەناسراوە ، کە فۆڕمی « کا ، کێ » ی هەبووە وردە وردە لە زمانی فارسیدا لەگەڵ « کو » بەکار هاتووە و بە فراوانی بەدیار کەوتووە . لە رووی سینتاکسیەوە وەك ووشەی پرسیار و ئامرازی گەیەنەری رستـــەکان بەیەکەوە بەکاردێت ، ئەم ووشـــانە بۆ دروســـتکردنی فۆڕمی رســـتەی لێکدراوی شوێنکەوتوو خواز زۆر بەکار هاتن ، کە دەیانتوانی جۆرەهـــا رستەی شوێنکەوتوو بگەیەننە رستەی سەرەکی . ووشەی « کێ » دەتوانرێ

بەکار بهێنرێت وەك راناوی پرسیار و نسبەتدار « کێ » دەکەوێتە دوای ناوی گیاندار و بێ گیان •

ووشەکانی « کا ، کو » بە فراوانی وەك ئامرازی گەیەنەر بەکار دەهاتن ئەم ووشانە وردە وردە بە پێی رۆژگار واتای ووشەیی خۆیان ونکردە لە کاتێکی زووی زمانی فارس نوێدا دەوری راناوی نسبەتدار « کێ » و ئامرازی « کا ، کو » دێتە پێشەوە ، لە سەرەتاوە لە رۆلی ئامرازی « کێ » دەوری دەگێرا ، کە هەر وەکو ئامرازی گشتی وەستاو مایەوە و وەك راناوی نسبەتدار بەکار هات •

لەگەڵ ئەوەشدا لە زمانی دانیشتوانی ئەسفەهان هەر وەك م• بەخەر لە کتێبەکەیدا ( سبك شنالهی یا تاریخ تطور نثر فارسی (سەملی) (أ) تهران ١٣٣١ل ، ٢٠٧ ( محمد تقی بهار ـ ملك الشعراء ) دەڵێت ، کە تا ئێستا ئامرازی گەیەنەر « کو » •••[1] ماوەتەوە ؟ هەروا لە هەندێ سەرچاووەکانی تازەدا لەگەڵ « کی » « کو » ش بەکار دێت • هەروا بەهار دەڵێت بوونی «کی» بە «کە» دەگەرێتەوە سەدەی «٩» ی کۆچی یان نزیکی سەدەی نۆیەم • هەروا هەر لەم سەدەیە «کی» ماوەتەوە ، بۆیە بەکار هێنانی وەك پرسیار و لەگەڵ ئەودا « کاه » بەکار دێت بەکار هێنانێکی لابەلای ، وە بەتایبەتی لە زار گۆتەدا • هەروەها بەهاری بەرێز دەڵێت ، کە «کە» لە کۆندا هەمیسان بە واتای « هرکس » « هەرکەس » بەکار هاتووە • بۆنموونە :

**خدارا ندانست و طلعت نکرد**
**که بر بخست و روزی قناعت نکرد**

هەمان دێڕ بە « هرکس » واتاکەی ناگۆڕی بۆنموونە :

**خدارا ندانست و طلعت نکرد**
**هرکس بر بخت و روزی قناعت نکرد**
**«دانەر»**

---

(١) بڕوانە لاپەرەی داهاتوو •

له بەرهەمی کلاسیکیدا ئامرازی « کە » وەك « کجا » دەتوانرێ بەکار بهێنرێت • گەلێ جار لە بەرهەمی ئێستاشـــدا بەکاردێت • دەشتوانرێ وەك ئامرازی گەیەنەری بەکاربێت بەتایبەتی لەزمانی داریدا • بۆنموونە :

**یکی خوب چهره پەرستنده دید**
**کجا نام او بود گسرد آ فرید ( فردوسی شاهنامه )**

**....(۱)**

ئامرازی « کە » لە زمانی ئەدەبی ئیمڕۆی کوردیشـــدا هەیـە و وەك ئامرازی « گەیەنەر » بەکاردێت • ئەم ئامرازە لەم زمانەدا هێجگار باو بڵاوە و بەکار هاتووە[۲] بۆنموونە :

**...... کەچی ئێستا دوای چارەگە سەعاتێك ، دوای هێنندەی ، کە**
**تەنها بگاتە خەستە خانە و بێتەوە ، وەك پەیکـــەرێك لەبەر دەممدا ئەچەقێ ، ئەلێ :ـ مرد ... (ك• ژ• ت• ل ـ ٤٧) •**

ئامرازی « کە » ی گەیەنەر دەتوانێ جۆرەها رســـتەی شوێن کەوتوو بگەیەنێتە رستەی سەرەکی لە نێو رســـتەی لێکدراوی شوێنکەوتووخوازدا • وەك رستە شوێن کەوتووەکانی : موبتەدایی ، خەبەری ، بەرکاری ، کاتی ، دیارخەری ، ئامانجی و مەرجی و روونکەرەوەیی ...[۳]

---

(۱) بۆ نووسینی ئیتیمۆلۆژیە سەبارەت ئامرازی « کە » سودێکی زۆرم لـە کتێبەکەی مامۆستا روبینچك یو• ئـا• وەرگرتووە ، کە بە ناوی « رستە ئاوێتەکات لەگەڵ رستە شوێن کەوتووەکانی دیارخەری لە زمانی ئەدەبی ئیمڕۆی فارسیدا » مۆسکۆ ، ۱۹٥۹ بەروسی •

(۲) بڕوانە نامەی دکتۆراکـــەم بەروسی و دەستنووس نامەکە بەزمانـــی کوردی رۆڵی ئامرازی « کە » لەبەش دووەمیدا •

(۳) بڕوانە رۆڵی ئامرازی « کە » لەبەشی دووەمی نامەی دکتۆراکەم بەروسی و دەستنوسی بە کوردی •

**١ ـ ئامرازی « كه » رستەی شوێنکەوتووی موبتەدایی دەگەیەنێتە رستەی سەرەکی**

**دیارە ،**
**كه**
**دەوران ئەبلەھ پەرستە**
**هوشیار و دانا رووی لە نوشوستە ( پەند ـ کەریم. ل ـ ٨٤ )**

لەم رستە لێکدراوە شوێنکەوتوو خوازەدا ئامرازی « كــه » رستەی « دەوران ئەبلەھ پەرستە » گەیاندۆتە رستەی سەرەکی ، كە رستەیەکی شوێن کەوتووی موبتەدایە .

**٢ ـ ئامرازی گەیەنەر « كه » رستەی شوێن کەوتووی خەبەری دەگەیەنێتە رستەی سەرەکی .**

× **بەخێری نۆزدە ساڵت تەمەنە و هێشتا بەوەت نەزانیوە ،**
**كه**
**چای شیرین مانای خـــۆشەویستی‌یە .**
**( ك. ژ. ت. ل ـ٧٩ )**

× **هەستی بـــەوەکـرد ،**
**كه**
**پێویستە قسەیەك بکات.(خ. ئا. ل ـ٢٠)**

× **من خۆم بەوە ئەزانم ،**
**كه**
**ئاوەها ملت ئەشکێنم بۆ خوارەوە و دۆزەخت نیشان ئەدەم . ( ك. ژ. ت. ل ـ٨)**

لەم هەر سێ رستانەدا رستەکانی ( چای شیرین مانای خۆشەویستی‌یە ، پێویستە قسەیەك بکات ، ئاوەها ملت ئەشکێنم بۆ خوارەوە و دۆزەخت نیشـــان ئەدەم ) رستەی شوێن کـــەوتووی خەبەرین و بەیارمەتی ئامرازی « كه » ی گەیەنەر گەیشتوونەتە رستەی سەرەکیەکان .

٣ ـ ئامرازی « که » رستەی شوێن کەوتووی بەرکاری دەگەیەنێتە رستەی سەرەکی ٠

× ئەو ساتە بڕوای هێنا ،
که
ئەگەر برا لە پشت برا بێ ، ئەوە خوشکین
بۆ رۆژی خۆی لە بـــرا زۆرتـــــرە ٠

( خ٠ ئا٠ ل ـ٦)

× ئێستەش ئەبینم ،
که
ئەو عەهدەی لە بیر بردۆتەوە
ئەو گرەی بۆ من لە دنیا بوو هەمووی نیشتۆتەوە (پەند ٠کەریم٠ ل ـ٤٩)

× هەوڵم ئەدا تێی بگەیەنم ،
که
تەنها بۆ مەشق کردن ئەچین ٠

(ک٠ ژ٠ ل ـ٦٩)

لەم سێ رستە لێکدراوە شوێن کەوتووخوازانەدا رستەکانی ( ئەگەر برا لە پشت برا بێ ، ئەوە خوشکیش بۆ رۆژی خۆی لە برا زۆرترە ، ئەو عەهدەی لە بیر بردۆتەوە ، تەنها بۆ مەشق کردن ئەچین ) رستەی شوێن کەوتووی بەرکارین و وەڵام لە سەر پرسیاری چی ؟ دەدەنەوە بەیارمەتی ئامرازی « که » ی گەیەنەر گەیشتوونەتە رستەی سەرەکی ٠

٤ ـ ئامرازی « که » رستەی شوێن کەوتووی کاتی دەگەیەنێتە رستەی سەرەکی ٠

× که
خەزاڵ لە دایك بوو ، هێشتا کاوور سەر نەبڕابوو ٠

× که
تەزوی ئازاری ئەشکێ
بەباویشکێ ٠٠٠
ئەچێتەوە دۆخی جاران
وەك نە بای دیبێ و نە باران ( پەند٠ کەریم ٠ ل ـ ٤٦ )

× **لەبەر ئەوە زۆر جار ،**
**کە**
**چاخانەکەی چۆل ئەبوو ،**
**نەهاتەلام ٠**

**( ك٠ ژ٠ ت٠ ل ـ٥٨)**

لەم سێ رستە لێکدراوە شوێن‌کەوتووخوازانەدا رستەکانی ( خەزاڵ لە دایك بوو ، تەزوی ئازاری ئەشکێ بە باویشکێ ٠٠٠ ، چاخانەکە چۆڵ ئەبوو ) رستەی شوێن‌کەوتووی کاتین و وەڵام لەسەر پرسیاری « کەی ؟ » دەدەنەوە و بەیارمەتی ئامرازی « کە » گەیشتوونەتە رستەی سەرەکی ٠

**٥ ـ ئامرازی « کە » رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەری دەگەیەنێتە رستەی سەرەکی ٠**

× **تا دوێنێش لەشەرم و تەریقی‌یا ئارامم لەبەر ئەبڕاو جێگەم بەخۆم نەئەگرت ، کەچی بی ئارامی ئەمرۆم ، ئەنجامی ئەو**
**هێزە ئەفساناوی‌یەیە ،**
**کە**
**گیان و هۆشمی هێناوەتە جۆش و خرۆش ٠**

**(ك٠ ژ٠ ت٠ ل ـ٧٦)**

× **بەردێك ،**
**کە**
**نەزان بیخاتە ناو ئاو**
**دەرنایە بەسەد عاقڵ بەناو**

**( پەند٠ کەریم٠ ل ـ٥٥ )**

لێرەشدا رستەکانی ( گیانو هۆشمی هێناوەتە جۆش‌و خروش ، نەزان بیخاتە ناو ئاو ) رستەی شوێن‌کەوتووی دیارخەرین‌و ، وەڵام لەسەر پرسیاری (کامە )؟ دەدەنەوەو بەیارمەتی ئامرازی « کە » گەیشتوونەتە رستەی سەرەکی ٠٠٠[1] ٠

---

(١) **بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ٠**

**٦ ـ ئامرازی « كە » رستەی شوێن كەوتووی ئامانجی دەگەیەنێتە رستەی سەرەكی •**

**× تەنها ئەم وتەیە بەس بوو بۆئەوەی**
**كە**
**ئافتاو لەو پەڕی مەبەستم تێ بگات •**
**( ك• ژ• ت•ـل ـ٨٢)**

**× بەزگی برسی و بەزگێ تێرین**
**لێمان ناگەڕێن ،**
**كە**
**خۆش رابوێرین ( پەند كەریم ل )**

لێرەشدا رستەكانی ( ئافتاو لەو پەڕی مەبەستم تێبگات ، خۆش رابوێرین) رستەی شوێنكەوتووی ئامانجین •

**٧ ـ ئامرازی « كە » رستەی شوێنكەوتووی مەرجی دەگەیەنێتە رستەی سەرەكی •**

**× هەر شوێني ،**
**كە**
**ئاو گرتی ئاوایە**
**دێمە كار كێلان رەنجی بە بایە ( پەند• كەریم• ل ـ ٤٣ )**

**× كە**
**پشیلەی راوكەر لەماڵا نەما**
**شك ئەكەوێتە تلیل و سەما (پەند• كەریم• ل ـ ٦١ )**

**× كە**
**دوژمنت كەوت •**
**تۆ پێی پیا مەنێ**
**زەبوون كوژ مەبە لای خوا لا مەنێ (پەند• كەریم• ل ـ ٥٩)**

لێرەدا رستەكانی ( ئاوگرتی ئاوایە ، پشیلەی راوكەر لە ماڵا ئەما ، دوژمنت كەوت ) رستەی شوێنكەوتووی مەرجین و بە یارمەتی ئامرازی گەیەنەر « كە » گەیشتوونەتە رستەی سەرەكی • ئامرازی گەیەنەری « كە » ی ئێرە جێگای ئامرازی گەیەنەر « ئەگەر »ی گرتۆتەوە •

**٨ ـ ئامرازی « كه » رستەی شوێنكەوتووی ڕوونكەرەوەیی دەگەیەنێتە رستەی سەرەكی**

× **وام ئەهات بە بیرا ،**
**كه**
**ئیتر لە سەیركردنی تێر نەبم٠(ك٠ژ٠ن٠ل٨١)**

× **خۆ دەرونیشم جۆشێكی وەهای سەندبوو ،**
**كه**
**ئەتوت ( ئاگری نەورۆزی) تیاكراوەتەوە ٠**
**( ك٠ژ٠ت٠ل ـ٨١)**

× **ئەمڕۆ وا هەست بە خۆم ئەكەم ،**
**كه**
**هێزێكی ئەفسانـاوی لە ناخی دڵ و دەرونما ڕەگی داكوتا وە و ئارامی لەبەر بڕیووم ٠ (ك٠ژت٠ل ـ٧٥)**

لەم رستە لێكدراوانەدا رستەكانی ( ئیتر لە سەیركردنی تێر نەبم ، ئەتوت ئاگری نەورۆزی تیا كراوەتەوە ، هێزێكی ئەفسانـاوی لە ناخی دڵ و دەرونما ڕەگی داكوتاوە و ئارامی لەبەر بڕیووم ) ٠ رستەی شوێن كەوتووی ڕوونكەرەوەین و بەیارمەتی ئامرازی « كه » گەیشتوونەتە رستەی سەرەكی ٠

**ئامرازی گەیەنەر « بۆئەوەی »**

ئامرازی « بۆئەوەی » یەكێكە لە ئامرازە گەیەنەرەكـان ، كه دەتوانێ رستەی شوێنكەوتوو بگەیەنێتە رستەی سەرەكی ٠ بۆنموونە :

× **كاكە سوور و عەیشان پێیێكیان كرد بە دوو ،**
**بۆئەوەی**
**دوانەكەون ٠ (ئەك٠ل ـ٣٩)**

لەم رستەیەدا ئامرازی « بۆئەوەی » توانیویەتی رستەی شوێن كەوتوو (دوانەكەون) بگەیەنێتە رستەی سەرەكی كاكە سوور و عەیشان پێێكیان كرد بە دوو ) لە رستە لێكدراوە شوێن كەوتوو خوازەكەدا ٠

ئامرازی « بۆ ئەوەی » ی گەیەنەر واتای ( تا ، تاوەکو ، هەتاکو ) ش دەگەیەنێ • بۆنموونە :

**بەڕاستی زۆر بە پەرۆش بووم ،**
**بۆئەوەی**
**ئەوپیاوە ببینم • (خ•ئا•ل–٤٠)**

لەم رستەیەدا دەتوانین لە بریتی « بۆئەوەی » ئامرازەکانی ( تا ، تاوەکو ، هەتاکو ) دابنێین بە بێ ئەوەی واتاکەی بگۆڕێ • بۆنموونە :

**بەراستی زۆر بە پەرۆش بووم ،**
**تـا**
**ئەو پیاوە ببینم •**

**بەراستی زۆر بە پەرۆش بووم ،**
**تاوەکو**
**ئەو پیاوە ببینم •**

**بەراستی زۆر بە پەرۆش بووم ،**
**هەتاکو**
**ئەو پیاوە ببینم •**

ئەو رستەیەی ، کە ئامرازی « بۆئەوەی » ی گەیەنەر دەیگەیەنێتە رستەی سەرەکی ، شوێن‌کەوتووی ئامانجیە • بۆنموونە :

**هەندێکیان چووبوونە سەر پەرژینی قوتابخانەکەی ئێمە و باخچەکەی یانەی فەرمانبەران ،**
**بۆئەوەی**
**بەباشی چاویان بەخاوەن شکۆ بکەوێ •**
**(ئە•ك•ل–٥٦)**

رستەی ( بە باشی چاویان بە خاوەن شکۆ بکەوێ ) رستەیەکی شوێن کەوتووی ئامانجیە • رستەی شوێن کـــەوتووی ئامانجی لە زمانی کوردیدا زۆرن • بۆنموونە :

**ئیستگەی بێ تەلی لەندەن و بەرلین بوو بوونە نەرزگای ئەو خەڵکە ،**
**بۆئەوەی**
**گوێ لە هەواڵی جەنگ بگرن ۰ ( ئە۰ك۰ـ ل ، ٦)**

لەم جۆرە رستە لێکدراوە شوێن کەوتوو خوازانەدا فرمانی رستەی شوێن کەوتوو ناتوانی لەیەك کاتدا بن ، بەڵکو هەردەم لە کاتی جیا جیا دەبن ۰

بۆ نموونە :

**ناوە ناوە بۆ مەشق کردن شەیپورِ لێئەدرا ،**
**بۆئەوەی**
**خەڵکەکە دوکان و بازارِ دابخەن و خۆیان لە نزیکترین جێگـــەی خۆشاردنەوەدا پشارنەوە ۰**

فرمانی « لێئەدرا » لە سیفەی مەجهول ـشاراوە ـ دایە بەڵام فرمانەکانی (دابخەن ، بشارنەوە) لە سیفەی فرمانی مەنسوبدان ۰

ئامرازی گەیەنەر « بۆئـــەوەی » دەتوانێ بکەوێتــە پێشەوەی رستە و ناوەڕاستی رستە ، بەڵام بەزۆری دەکەوێتە ناوەوەی رستە ۰ بۆنموونە :

**گەلێ کەس ، هەتا ئەوانەی رێگاشیان بە بەر دەرگای سەرادا نەبوو پیاسەیەکی ئەو ناوەیان ئەکرد ،**
**بۆئەوەی**
**سەر و سوراخێکی ئەڵەمان کوردی بزانن ۰ ( ئە۰ك۰ لـ٦ )**

لەم رستەیەدا ئامراز کەوتۆتە ناوەوەی رستە ۰ هەروا دەشتوانێ بکەوێتە پێشەوە ۰ بۆنموونە :

**بۆئەوەی**

**دەرگای گفتوگۆی لەوەڵا بکەمەوە ،**
**هیچم نەدۆزیەوە ۰**

**(خ۰ئا۰ لـ٣٨)**

**ئامرازی گەیەنەری « کەچی »**

ئەم ئامرازەش لە زمانی ئەدەبی ئیمڕۆی کوردیدا دەتوانێ ڕستەی شوێن کەوتوو بگەیەنێتە ڕستەی سەرەکی • بۆنموونە :

بە شەو و بە ڕۆژ لە ژێر ڕەهێڵـــەی بەفروبارانا لـەبـــەر قرچـــەی

**هەتا وا توانا نێیژە ، هێز بڕێژە ،**

**کەچی**

**هەمووی بۆ ئاغابێت • (خ•ئا• ل ـ٤٤)**

لەم ڕستە لێکدراوە شوێن کەوتوو خوازەدا ئامرازی « کەچی » توانیویەتی ڕستەی شوێن کەوتوو ( هەمووی بۆ ئاغا بێت ) بگەیەنێتە ڕستەی سەرەکی •

بەم جۆرە ڕستە شوێن کەوتووانـــە دەوترێت ڕستەی شوێن‌کەوتووی ناچارەیی • بۆنموونە :

**لەم سەر باسی خێزانەکەمم لەمێشکم دوور ئەخستەوە ،**

**کەچی**

**لەو سەر بەبێ ئەوەی بە خۆم بزانم پیایا ئەچوومەوە •**

**(ژ•ك•ت• ل ـ٧٠)**

لەم ڕستەیەدا ڕســـتەی ( لەو سەر بەبێ ئـەوەی بەخـــۆم بزانم پیایا ئەچوومەوە ) ڕستەیەکی شوێن‌کەوتووی ناچارەیی‌یە •

فرمانی خەبەری هەردوو ڕستەکان لەم جۆرە ڕستانەدا دەتوانن لەیـــەك کاتدا بن یان لە کاتی لێك جیا • بۆنموونە :

**تەنها بۆنان خواردن ئەهاتمە دەرەوە ،**

**ئاخری هەر تووشیش ئەبووم •**

لەم ڕستەیەدا فرمانی خەبەری ڕستەی سەرەکی فرمانی « ئەهاتمە » یە و فرمانی خەبەری ڕستەی شوێن‌کەوتوو فرمانی « ئەبووم » ە هەردووکیان لەکاتی ڕابردووی بەردەوامن • فرمانەکان دەتوانن لە کاتی ئێستادا بن • بۆنموونە :

× به قورم گرت تا ئیبلیس و جنوکه‌کانیش بەرەمەزان خۆیان ئەشارنەوە ،
کەچی
ئێوە بە ناخێرتان واز ناهێنن • ( خ•ئا• ل–٥٦ )

× لای ئێمە کردنەوەی قوتابخانەیەك چەند گرانە ،
کەچی
داخستنی چەند ئاسانە ،

بەراستی ئەمە نەگبەتیە • (خ•ئا• ل–٢٩)

هەروا دەبێت ، کە فرمانەکان لەکاتی جیاین • بۆنموونە :

ئەو فەرمووبەتی خڕ نی‌یە ،
کەچی
ئێمە ئەلێین خڕە • ( خ•ئا• ل–١٩ )

فرمانی رستەی سەرەکی لە کاتی رابردوو دایە ، بەڵام فرمانی رستەی شوێن‌کەوتوو لە کاتی ئێستا دایە •

شوێن ئامرازی گەیەنەر « کەچی » لە رستەی لێکدراوی شوێن کەوتووخوازداهەر ناوەڕاستی رستەکانە و دەکەوێتە نێوان رستەی شوێن کەوتوو و سەرەکی • بۆنموونە :

× خوا عەیبی بزنی ختسوەتە روَ
کەچی
کلاوی کردووە بۆ بەرِوَ

× ئەبی دەست ماچ‌کەن ، کە لە دێیەکی وەها دووردا قوتابخانە کراوەتەوە ،
کەچی
هەر باوکە و منالەکەی نانێرێ ، هەر باوکێکی‌ترە بەهانە ئەدۆزێتەوە و کوڕەکەی دەرئەهێنێ • ( خ•ئا• ل–٢٧ )

× پەلامارم دایە کەمێکی بکوتم ،
کەچی
ئەو شەیتانە وەك کەروێشکێك لە ژێر جنگما قەلەمبازی دا و بۆی دەرچوو •

( ك•ژ•ت• ل–٩٤ )

× هەموو رۆژێك ئەم كردەوەیەم لە ئافتاو ئەدی ،
کەچی
جارێك سەرنجم بۆ ئەوە نە ئەچوو ، لە خۆم بپرسم : « ئەرێ ئـــەمــە
بۆچی و یانی چی ؟ » ·

**ئامرازی گەیەنەر « تا »**

« تا » ئامرازێکی گەیەنەرە لە زمانی ئەدەبی ئیمڕۆی کوردیدا ، دەتوانێ رستەی شوێن‌کەوتوو بگەیەنێتە رستەی ســـەرەکی لەناو رستەی لێکـدراوی شوێن کەوتوو خوازدا • ئەم ئامرازە لە رووی واتاوە دوو جۆرە یەکێکیـان واتای ئامانج دەدات ، بەمەوە رستەی شوێن کـــەوتووی ئامانجی دەگەیـەنێتە رستەی سەرەکی ••• [١] • ئەوی تریان واتای پێوان و ئەندازە و ماوە پێشان دەدات بەمەشەوە رستەی شوێن کەوتووی ئەندازە و پێوان و ماوە دەگەیەنێتە رستەی سەرەکی • لە هەردوو جۆرەکانیشـــدا سێ خۆڕمی هەیە لـە رووی دروستبوونەوە • وەك : تا ، هەتا ، هەتاکو •

نموونە بۆئەوەی ، کە ئەم ئامرازە رســـتەی شوێن‌کەوتوو دەگەیەنێتە رستەی سەرەکی زۆرن • بۆنموونە :

**میمکە هۆڵێی کەڵبە لە دەم**
**لاشەی مێردی تووڕ دایە چەم**
**بۆ دۆستی نمەك بە حەرام**
**تــا**
**هەردوو بگەن بە مەرام ( ك·ژ·ت· ل‌ـ٨٨ )**

لێرەدا رستەی ( هەردوو بگەن بە مەرام ) رستەیەکی شوێن‌کەوتووە و بە یارمەتی ئامرازی « تا » گەیشتووتە رستەی سەرەکی ، ئەو رستەیەی ، کـــە ئامرازی ناو براو دەیگەیەنێتە رستەی سەرەکی پێی دەوترێ رســتەی شـوێن کەوتووی ئامانجی • بۆنموونە :

---

(١) بڕوانە لاپەڕەی داهاتوو ئەم ئامرازە دەتوانێ جێگای ئامرازی «بۆئەوەش» بگرێتەوە · بڕوانە ل‌ـ٧٩ی ئەم کارە ·

**کەوتە خۆ گۆڕین ،**
**تـا**
**مسجەلەکە بەرێت بۆ لای وەستا ٠ ( خ٠ئا٠ ل ـ٩١ )**

رستەی ( مسجەلەکە بەرێت بۆ وەستا ) رستەیەکی ئامانجییە ٠

ئەمویست منالم هەبێت ، هەتا بەشیری ئەم بڕوایە

**پەروەردەیان کەم ،**
**تـا**
**ئەوەی لەمن قەوما لەوان نەقەومێتەوە ٠**

**( خ٠ئا٠ ل ـ٤٣ )**

ئامرازی « تا » هەر ناتوانێ بەس رســـتەی شوێن کـەوتووی ئامانجی بگەیەنێتە رستەی سەرەکی ، بەڵکو دەتوانێ رستەی شوێن کەوتووی ماوەش بگەیەنێتە رستەی سەرەکی ٠ بۆنموونە :

**منیان خستە نێوان خۆیانەوە و هەر یەکەیان دەستێکی**
**گرتبووم بەناو بازاڕ تێئەپەڕین ،**
**تـا**
**لـە کەبابخانەکەی وەستا شەریـــف**
**نزیکبووینەوە ٠ ( ئە٠ك٠ ل ـ٢٤ )**

رستەی ( لە کەبابخانەکەی وەستا شەریف نزیك بووینەوە ) رستەیەکی شوێن کەوتووی ماوەیـــە و ماوە پیشان دەدات ٠ هەروا دەتوانێ ٠ هــەروا دەتوانێ رستەی شوێن کەوتووی ئـەندازەش بگەیەنێتە رســتەی ســەرەکی ٠

بۆنموونە :

**قەدری مانگ نیە ،**
**تـا**
**نەگاتە شەو**

**گەرما ئاوی سارد ئەخاتە برەو**

گەلێجار لەگەڵ ئەم ئامرازەدا پیتی ( هە ) دێت و دەکـــەوێتە پێشەوەی

بەمەوە فۆرمی نوێی تا دروست دەبێ و دەبێتە « هەتا » هەر بە هەمان ئەرك ، وەزیفە • بۆنموونە :

× **وەستا ،**
**هەتا**
**کەمێك پشوو بدات • ( خ•ئا• ل_٤١ )**

× **پێم مەڵێن ریست وەك خوری خاوە**
**کوێر ،**
**هەتا**
**دەمرێ بە هیوای چاووە ( پەند • کەریم• ل_١١٥ )**

× **بە پەنجەرەکەوە وەکو پێوەی نووسابێ ووشك بوو ،**
**هەتا**
**ئێوارەیەکی درەنگ لە جێگای خۆی نەجولا • ( خ•ئا• ل_٥١ )**

× **سوار ،**
**هەتا**
**نەگلێ نابێ بە سوار**
**برنج نەکوترێ ناچێتە بازاڕ ( پەند • کەریم • ل_٩٨ )**

لەم رستەیەدا دەبووایە ئامرازی « هەتا » بکەوتایە پێش ووشەی « سوار » بەمەوە ئامرازی « هەتا » دەتوانێ بکەوێتە پێشەوەش بەڵام ئەم حاڵەتە لە زمانی ئەدەبیدا زۆر کەم بەر چاوو دەکـــەوێ ، چونکـــە بە زۆری هەر دەکەوێتـە ناوەوە • نموونە بۆ « تا » کە فۆرمی (هەتا)یە :

**بۆ مبایەکی ئاگراوی وا ئەتەقێنم**
**کەس نەمێنێت ،**
**تـا**
**ناو جەرگەی ئەرز ئەسوتێنم**
**لەگەڵ ئەوەش ترسنۆکن قورسن بێ هێزن**
**بەڵام هەرگیز شەلم ، کوێرم ، دەست ناپارێزن (پەنە کەریم • ل ـ ١٠٤)**

جاری‌وا هەیە ، کە « تا » دوو ئامرازی تر وەردەگـــرێ وەك « هـــە ، کـە دەکەوێتە پێشەوە و « کو » ، کە دەکەوێتە دواوەی بەمەوە ( هە + تا + کو ) **هەتاکو** دروست دەبێ • بۆنموونە :

**گا مەرە چەپۆك گا پاڵ پێوە نان**
**هەتاکو ئێشیان لە ئیش ترازان ( پەند ٠ کەریم ٠ ل–١١١)**

**ئامرازی گەیەنەر «چونکە»**

ئامرازی « چونکە » ش یەکێکە لە ئامرازەکانی گەیەنەر ، کە دەتوانێ رستەی شوێن کەوتوو بگەیەنێتە رستەی سەرەکی ٠ بۆنموونە :

**زوانی خۆت بگرە دەخیلە لەو وشانەی وا حەقە**
**چونکە**
**مەشهورە ، کە حەق لای بێ تەمیز تاڵ و رەقە ( پەند ٠ کەریم ٠ ل–١٠٨)**

ئەو رستانەی ، کە شوێن کەوتوون و بەیارمەتی ئامرازی گەیەنەر « چونکە » دەگەیەنە رستەی سەرەکی لەنێو رستەی لێدراوی شوێن کەوتوو خوازدا پێیان دەوترێت رستەی شوێن کەوتووی هۆیی ٠ بۆنموونە :

× **ئەزانن بۆ دەبێتە دز ، هەژار و بێکەس وبرسی ؟**
**لە بۆ تێر بوونی زگی**
**چونکە**
**( زگی برسی چ ناپرسی ) ( پەند ٠ کەریم ٠ ل–٩٥ )**

**نێر و مێ هەردوو بە جوتە بۆ وەتەن هەوڵی نەدەن**
**دوورە دەرچوونی لەدیلی ، مەل بە باڵێ نافرێ**
**هەوڵی راستی هەر دولا ئامانجی میللەت سەر ئەخا**
**چونکە**
**مەعلومە ( بە یەك دەس چەپڵە قەت لێ نادرێ )**

ئامرازی « چونکە » لە ناو رستەی لێکدراوی شوێن کەوتوو خوازدا هەردەم جێگای ناوەڕاست دەگرێ ؛ یانی دەکەوێتە نێوان رستەی سەرەکی و رستەی شوێن کەوتوو ٠ بۆنموونە :

**لەم چەند مانگی دواییەدا ئەوەی بە دەگمەن بۆ هەڵئەکەوت ،**
**چونکە**
**لەو ماوەیەدا رۆژانێکی ئەوتۆی بەسەر بردبوو ، کە یا هەر هیچی دەس نەئەکەوت ، وە یا لە سێ چوار پەنجایی تێپەڕی نەئەکرد ٠ ( ك٠ژ٠ت٠ ل–٦١ )**

بەڵام هەندێ جار دەتوانێ بکەوێتە پێشەوەی رستە ، بە تایبەتی لەو حاڵەتەی ، کە رستەکە لە پارچەیەکی شعر بوو نەك پەخشان لەبەر پێداویستی یاسای شیعر • بۆنموونە :

**چونکە**
**خوا راستە و راستی خۆش ئەوێ**
**داری راست بەلای چەوتا نانەوێ ( پەند • کەریم • ل-٧٤ )**

فرمانی خەبەری هەر دوو رستەکان رستەی سەرەکی و رستەی شوێنکەوتوو بە زۆری لە یەك کاتدا دەبن ، کاتەکەش بەزۆری لە رابردوو دەبێ • بۆنموونە :

**سانی جارێك چاووم پێیان نەئەکەوت ،**
**چونکە**
**دەربەدەر و هەلاتو بوون •**

فرمانی یەکەم لە کاتی رابردووی بەردەوامی نەفیدایە ، بەڵام فرمانی دووەم لە کاتی رابردووی دوور دایە • نموونەش لەم بابەتە زۆرن ، وەك :

× **دوێنێ شەو تا درەنگ وەختێك خەو نە چووە چاووم ،**
**چونکە**
**زۆر بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی ئەم**
**سبەینێیەم ئەکرد • ( ك•ژ•ت• ل-٨٠ )**

× **باسی گەردەنیش بانەکرێ ،**
**چونکە**
**ئەگەر بوترێ لە شوشە و ئاوی**
**بێگەردی ئەکرد ئەوە هێشتا کەمە •**
**( خ•ئا• ل-٣ )**

لێکۆڵینەوەی نموونەکان وا پیشانمان ئەدەن ، کە هەندي جار لە برێتی ئامرازی « چونکە » ئامرازی لێکدراوی گەیەنەر « لەبەر ئەوەیکە » بەکار دێت • بۆنموونە :

**ئەوی راستی بێ ، ئەتوت ئەم و تانەم بە چەقۆ لە قوڕگ دەر ئەهێنن ! • ئەمەش تەنها ،**
**لەبەر ئەوەیکە**
**ئەمە یەکەم جار بوو ئەم قسانەم هەڵئـــــەدا**
**بەگوێی کچێکدا • ( ك•ژ•ت• ل-٨٢)**

گەر هەمان رستە بە ئامرازی « چونکە » بنووسین واتاکەی ناگۆڕێ •
بۆنموونە :

**ئەوی راستی بێ ، ئەتوت ئەم وتانەم بە چەقۆ لە قوڕگ**
**دەر ئەهێنن ! • ئەمەش تەنها ،**
**چونکە**
**ئەمە یەکەم جار بوو ئەم قسانەم**
**هەڵئەدا بەگوێی کچێکدا •**

نموونەی تر لەسەر «چونکە»

**لای خەڵك و خواو دراوسێیەکان خۆشەویست بوو ،**
**چونکە**
**کاسبێکی پاك و لە خوا ترس بوو • ( خ•ئا• ل-٥٧ )**

**ئامرازی گەیەنەری « ئەگەر »**

لە زمانی ئەدەبی ئیمرۆی کوردیدا «ئەگەر»یش ئامرازێکی گەیەنەرە ، دەتوانێ رستەی شوێن کەوتوو بگەیەنێتە رستەی سەرەکی • بۆنموونە :

× **ئەگەر**
**پشیلە لە ماڵ نەبێ ،**
**مشکان تلیلیانە ( پەند • کەریم • ل،٤٣ )**

× **ئەگەر**
**ئەکەویە جوست و جۆی ئەحواڵ**
**قسە یا لە شێت ببیە یا منداڵ ( پەند • کەریم • ل-١٠٨ )**

ئەو رستە شوێن کەوتووانەی ، کە بە ئامرازی « ئەگەر » دەگەیەنرێنە رستەی سەرەکی پێیان دەوترێت رستەی شوێن کەوتووی مەرجـــــی •
بۆنموونە :

× ئەگەر
تو ججاری حاجی ،
پارە بێنـــە
مەتاعە نێك و بەد ، دنیا دوكانە

× بە گاڵتە و گەپێكەوە پێـم ووت ، ئاخـــۆ چایەكانی ئەمڕۆشـــــم ، وەك ڕۆژانی تر شیرین ئـــەبن ؟! بـــە دەم زەردەخەنــە و نازكردنێكی دڵ فڕێنەوە وتی : ئا ،
ئەگەر
وەك جاران ڕەتیان نەكەیتەوە •
( ك•ژ•ت• ل ـ٨٣ )

ئامرازی گەیەنەر « ئەگەر » لە زمانی كوردیدا ڕواڵەتی تریشی هـەیە ، وەك ( گەر ، مەگەر ) • بۆنموونە :

× ژنی بەد ژانە ،
گەر
خۆتی لێدەی ماڵت وێرانە • ( پەند • كەریم • ل ـ٩٦ )

× ڕیوی بە فێل ناوەسێ ،
مەگەر
تەڵە بێ بەستێ • ( ك•ژت• ل ـ٧١ )

× باشیش نیە ئـەم قسانە ئەكەم ،
ئەگەرچی
لە دڵی خۆشما بێت•(ك•ژ•ت•ل ـ٧١)

بە لێ كۆڵینەوە لەم سێ ڕستانەی سەرەوە بۆمان دەردەكەوێ ، كە فۆڕمی « گەر » لە ئامرازی گەیەنەر « ئەگەر » هاتووە ، بە جیاوازی ئەوەی ، كە لە « گەر » پێتە قاڵیی « ئە » كەوتووە و ماوەتەوە « گەر » • لەرستەی دووەمـدا ئامرازی « مە » ی نەفی كەوتۆتـــە پێشەوەی « گەر » و فۆڕمی « مەگـەر » دروستبووە ، لە هی سێیەمدا دەربڕینی یا ڕاناوی « چی » كەوتۆتـــە دوای ئامرازی « ئەگەر » و فۆڕمی « ئەگەرچی » دروست كردووە • هەرسێ حاڵەتەكە لە برێتی « ئەگەر » بەكار هاتوون •

یەکێك لە خاسیەتـەکانی ئامرازی گەیەنـەر « ئەگەر » ئەوەیە ، کـە هەردەم دەکەوێتە پێشەوەی رستە • بۆنموونە :

× **ئەگەر**

**بمانەوێ لەم دنیا و لەو دنیا نەبین ،**

**ئەبێ لەیادی نەکەین •**

**( خ•ئا• ل–٢٠)**

× **ئەگەر**

**قەڵەرەش رێ نیشاندەر بێ ،**

**ئەبێ گەورە هەر دەر بە دەر بێ •**

**( پەند • کەریم • ل–٤٣)**

جاری وا هەیە بەتایبەتی لەبـــەر فۆرمی ئەدەبی یان درێژی رســتە ئامرازی گەیەنەر « ئەگەر » دەکەوێتە نێوان رستەی سەرەکی و رستەی شوێن کەوتووی مەرجی ، بۆنموونە :

**بەهار بۆ فەسڵی زستانم ،**

**ئەگەر**

**یارم لەگەڵ بایە**

ئامرازی گەیەنەر « ئەگەر » خاسیەتێکی تریشی هەیە ئەوەیە ، کە زۆر جار لەگەڵ فرمانی خەبـەری هـەردوو رســـتەکان ؛ سەرەکـی و شـوێن کەوتوو ، کە فرمانێکی ئەسڵیە ، فرمانێکی یارمەتی دەریش دێت • بۆنموونە :

**درۆیە گەر گوتو‌یانە بەغونچێکی بەهار نایە ! ( پەند • کەریم • ل–٥٩ )**

× **ئەگەر**

**ئەیەوێ پێی بسکا ،**

**ئەبێ بژی •**

× **ئەگەر**

**بمانەوێ لەم دنیا و لەو دونیا نەبین ،**

**ئەبێ لەیادی نەکەین**

**( خ•ئا• ل–٢٠)**

**ئامرازی گەیەنەر « بۆیە »**

ئەم ئامرازە ئامرازێکی گەیەنەرە و زۆر بەکار دێت • بۆنموونە :

**مام پۆلیس وا دیار بوو گوێی لە دوا قسەکانی کۆیخا بوو ،**
**بۆیە**
**هاتە پێشەوە و سلاوێکی سارد و سڕی کرد • ( خ•ئا• ل-٢٧ )**

ئەم ئامرازە دەتوانێ ڕستەی شوێن کەوتووی تەسلیمی بگەیەنێتە ڕستەی سەرەکی • بۆنموونە :

× **باڵۆرەی بووك و خەسوی گوي لێبو**
**بۆیە**
**کچەکـەی نە ئـەدا بـە شـو**
**کەچی کچ دەستی لە دایکی بـەردا**
**مەیموون زۆر جوان بو ئاوڵەشی دەردا ( پەند • کەریم • ل-١٣٨**

× هەتا ئەو کاتە مامۆستای وای ئەزانی ، کە ئاغا ئەبێ قەڵەوێکی
**ورگ زل بێ ،**
**بۆیە**
**بە سەر سامی‌یەکەوە سەیری ئـەم ئاغا لەڕەیکـرد •**
**( خ•ئا• ل-١٧ )**

ئەم ڕستە شوێن کەوتووەی ، کە بە یارمەتی ئامرازی « بۆیە » دەگاتە ڕستەی سەرەکی لە ڕستەی لێکدراوی شوێن‌کەوتوو خوازدا ، ئەو خاسیەتەی ، کە فرمانی خەبەری هەردوو ڕستەکان ؛ شوێن‌کەوتوو و سەرەکی لە یەك کاتدا دەبن یا لە کاتی جیا جیا ؛ چ هەردووکیان لە کاتی ڕابردوو دەبن یا لە کاتی ئێستا ، وە یان لە کاتی ئاڵوگۆڕ ، وەك یەکێکیان لە کاتی ئێستا و ئەوی تریان لە کاتی ڕابردوو ؛ یان بە پێچەوانە • بۆنموونە :

× لە دوو توێیا ئەو پەڕی دڵسۆزی خۆشەویستیم
**ڕوون ئەبووەوە ،**
**بۆیە**
**ئەویش هەرکەسەری هەڵبڕی و سەرنجی**
**دایێ ، ڕوومەتەکانی هێندەی تر سوور**
**هەڵگەڕان • ( ك•ژ•ت• ل-٨٢)**

× **گومانم نەما ، پێم ڕاڤەبوێری ،**
**بۆیە**
**رووم لێ گرژ کرد ٠ ( خ٠ئا٠ ل-٣٨ )**

× **مام پۆلیس وا دیار بوو گوێی لەدوا قسەکانی کوێخا بوو ،**
**بۆیە**
**هاتە پێشەوە و سلاوێکی ساردوسڕی کرد ٠ ( خ٠ئا٠ ل-٢٧ )**

لەم دوو ڕستانەدا فرمانی خەبەرەکان ، فرمانن لـــە کاتی ڕابردوو دان هەروا دەشبێ لە کاتی ئێستادا بن ٠ بۆنموونە :

**کەسیش بڕوا بەمە ناکا ،**
**بۆیە**
**باسی نەکرێ باشترە ٠ ( خ٠ئا٠ ل-٣ )**

**نموونە بۆ کاتی لەیەك جیا زۆرن ، وەك :**

**هەوراز برین بۆ پیادەیەکی ڕانەهاتە کارێکی ستەمە ،**
**بۆیە**
**لە هیلاکیا لەپەل و پۆ کەوتبوم ٠ (خ٠ئا ل-٣٧ )**

فرمانی خەبەری ڕستەی سەرەکی فرمانی لکاوە لە کاتی ئێستادا « ە » ، کە بە ووشەی « ستەم » لکاوە ، بەلام فرمانی خەبەری ڕستەی شوێن کـەوتوو فرمانی خەبەری ڕستەی شوێن کـەوتوو فرمانێکـــی کاتی ڕابردووی دوورە « کەوتبووم » ٠

دەبێت فرمانی یەکـــەم ڕابردوو بێت و فرمـانی دووەم لە کاتی ئێستادا بێت ٠ بۆنموونە :

**وا دیار بو ، مامە سەعە تاقەتی لە بێ دەنگی ودانگە لێدان چوبو ،**
**بۆیە**
**ئەیویست بە هەر بیانویەکەوە بێت دەرگای قسەکردن بخاتە سەرپشت ٠ ( خ٠ئا ل-٥٦)**

# ئـەنجـام

(١) زۆر لە زاناو رێزمان نووسانی کورد و غـــەیری کورد لە کتێبـە رێزمانەکانیاندا شت و بابەتی بەنرخیـــان لە بارەی ئامراز بەگشتی و ئامرازی سینتاکس نووسیووە ، لەگەڵ ئەوەش نووسینەکە لە کـــەم و کۆڕی رزگاری نەبووە •

(٢) ئامراز لە رووی دروست بوونەوە دەکرێن بە دوو بەشەوە ، ئامرازی سادە و ئامرازی لێکدراو •

(٣) لە رستەی لێکدراوی شوێن کەوتوو خوازدا ، کە بەیارمەتی ئامرازی « بەڵکو » دروست دەبێت ، دەبێ لە رستەی ســـەرەکیدا ووشەی تەناسووبی « تەنیا ، نەوەکو » هەبێت •

(٤) ئامرازەکانی « وەکو ، ئینجا » دوو ئــەرك جێبــەجێ دەکـــەن ؛ ئامرازی « وەکو » سەرەڕای ئەرکی بەستنەوەی دوو رستە بەیەکەوە ئــەرکی وەکیەکیش وەدەست دەنێ ، کە لە روانییژیدا بەکار دێت ؛ یانی ئەمە ئامرازی دروستکردنی وەکیەکە ـ التشبیه ـ •

(٥) هەندێ ئارمراز هەن ، دەتوانن ئامرازی نەفی وەربگرن « نە » وەکو ئامرازی سینتاکس « وەکو » و فۆڕمی « نەوەکو » دروست دەکات •

(٦) هەر رستەیە ، لەو رستانەی ، کـە بە یارمەتی ئامرازی « ئەگینا » بەیەکەوە دەبەسترێنەوە دەبێ موبتەدای تایبەتی خۆی هەبێ •

(٧) « وه » کەکێکە لە ئامرازەکانی پەیوەسنداری زمانی ئەدەبی ئیمڕۆی کوردی ــ دیالێکتی سۆرانی ــ ، کە دەتوانێ دوو رستە بەیەکەوە بەستێتەوە •

(٨) « کە » ئامرازێکی گەیەنەرە لە زمـانی ئەدەبی ئیمڕۆی کوردیدا • ئەمە هێجگار باو و بڵاوە و زۆر بەکار دێت و دەتوانێ جۆرەها رستەی شوێن کەوتوو بگەیەنێتـــە رســـتەی ســـەرەکی لـە نێو رســـتەی لێکـــدراوی شوێنکەوتووخوازدا ، بۆیە پێی دەوترێ ئامرازی گەیەنەری گشتی • ئـەم ئامرازە لە رووی داهاتنیەوە لە ئامرازی « کی » ەوە هاتووە و پێشکەوتنی ئـەوە لە زۆر زمانی ئێرانی بەکار دێت وەك فارسی ، پوشـــتوو ••• هتد • جێگای ئامرازی « کە » پێشەوەی رستەیە لەو حاڵەتەی ، کـە رستەی شوێنکەوتووی کاتی بگەیەنێتە رستەی سەرەکی ، بـەڵام گـەر رســـتەی شوێنکـەوتووی کاتی بگەیەنێتە رســـتەی ســـەرەکی ، بەڵام گەر رستەی شوێنکـەوتووی دیارخەری بگەیەنێتە رستەی سەرەکی ، جێگای هەر نێوان رستەی سەرەکی و رستەی شوێن کەوتوو دەبێت ئەم ئامرازە دەتوانێ جێگای ئامرازی گەیەنـــەر « ئەگەر » بگرێتەوە •

(٩) ئامرازی گەیەنەر « بۆئەوەی » هەر دەکـــەوێتـــە نێوان رستەی سەرەکی و شوێن کەوتوو ، هەروا دەتوانێ واتاو وەزیفـــەی ( تا ، تاوەکو ، هەتاکو ) بگەیەنێ •

(١٠) ئامرازی « تا » دەتوانێ رستەی شوێنکەوتووی ئامانج بگەیەنێتـە رستەی سەرەکی ، هەروا دەشتوانێ رستە شوێن کـەوتووەکانی ئەندازەیی و پێوان و ماوەش بگەیەنێتە رستەی سەرەکی •

(١١) ئامرازی گەیەنەر « ئەگەر » دەتوانێ ئامرازی نەفی وەربگرێت ، وەك ئامرازی « مە » و فۆڕمی « مەگـــەر » دروست بکـــات ، یەکێـــك لـە خاسیەتەکانی تری ئەم ئامرازە ئەوەیە ، کە هەردەم دەکەوێتە پێشەوەی رستە ؛

لەو رستە لێکدراوە شوێن کەوتوو خوازەی ، کە بە یارمەتی ئامرازی « ئەگەر » دروست دەبێت ، هەردوو رستەکانی ـ سەرەکی و شوێن کـــەوتوو ـ فرمانی خەبەرەکانیان ، کە فرمانێکی ئەسڵیە فرمانێکی یارمەتی دەریش دێت • نـــەم ئامرازە فۆرمی « گەر ، ئەگەرچی ، مەگەر » یشی هەیە •

(١٢) چ ئامراز بەگشتی یان ئامرازی سینتاکس تا ئێستا نەبووـ ـنەتـە باسێکی سەر بەخۆ •

(١٣) ئەو رستانەی ، کە بە یارمەتی ئامرازی « یا » بە یەکـەوە دەبە ـ سرێنەوە بە زۆری رستەی یەك موبتەداین •

(١٤) ئامرازە پەیوەستدارەکان لە رووی ئەرکی خۆیانەوە هەندێکیـــان دەکرێن بە چوار بەشەوە ، وەك : و ، ش ، بەڵام ، یا ، ئەوسا ، بەشی بەیەکەوە بەستنەوە ، عەتف ، جیاکەرەوە و هامبەری •

(١٥) ئەو رستەیەی ، کە بە یارمەتی فاریزە بەیەکەوە دەبەسترێنەوە ، فرمانەکانیان بەزۆری لەیەك کاتدا دەبن ؛ چ هەر دووکیان لە کاتی ئێستا دەبن یان لە کاتی رابردوو •

(١٦) شوێنی ئامرازی گەیەنەر « کەچی » هەر نێوان رستەی سەرەکی و رستەی شوێن کەوتووە لە ناو رستەی لێکدراوی شوێن کەوتوو خوازدا •

(١٧) لە رستەی لێکدراوی شوێن کـــەوتوو خوازدا فرمانی خەبـــەری هەردوو رستان ـــسەرەکی وشوێن کـــەوتوو ـ ، کـــە بە یارمـــەتی ئامرازی « چونکە »ی گەیەنەر دەگەیەنە یەکتر لە یەك کاتدا دەبن •

# کورتکراوەکان

ل.

لاپەڕە

خ. ئا.

خۆری ئاوابوو دکتۆر کاوس قەفتان سلێمانی ١٩٧٠

ئە. ک.

ئەڵمان کوردی دکتور مارفی خەزنەدار بەغدا ١٩٦٩

پەند. کەریم .

پەندی پێشینان لە
شیعری کوردیدا کەریم شارەزا بەغدا ١٩٧٦

ک. ژ. ت.

کلاّفەیەك ژانی تووڕە
حوسێن عارف نەجەف ١٩٧١

# سەرچاوەکان


١ ـ سەعید سدقی کابان ، مختصر صرف و نحوی کوردی ، بەغدا ، ١٩٢٨ •

٢ ـ لێژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد ، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٦ •

٣ ـ محەمەد ئەمین هەورامانی ، سەرەتایێك لە فیلۆلۆژی زمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٣ •

٤ ـ نوری عەلی ئەمین ، ڕێزمانی کوردی ، سلێمانی ، ١٩٦٠ •

٥ ـ ئەحمەد حەسەن ئەحمەد ، ڕێزمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٦ •

٦ ـ جگەر خوێن ، آوا ئو دەستورا زمانێ کوردی ، بەغدا ، ١٩٦١ •

٧ ـ د• ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم ، ڕستەی لێکدراوی شوێن کەوتووخواز لەگەڵ ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری لە دیالێکتەکانی ناوەندی

٨ ـ توفیق وەهبی ، قواعد اللغة الكردية ، الجزء الاول ، الباب الثاني ، زمانی کوردیدا ، دەستنووس •
بغداد ، ١٩٥٦ •

٨أ ـ توفیق وەهبی قاڵبی « ئه »ی شێوەی سلێمانی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد بەرگ ـ١ـ بەش ـ١ـ ل ، ٩ •

٩ ـ مصطفى خرم دل ، صرف دستور زبان کردی ـ سورانی ، تبریز ، ١٣٤٧ك ، بەفارسی •

10- Курдоев К.К. Курдско-русский словарь
- краткий очерк
грамматики курдского
языка - Москва, 1960

١٠- كوردۆیێف ك. ك. فەرهەنگی كوردی روسی - كورتە باسێكی ڕێزمانی
زمانی كوردی - مۆسكۆ ، ١٩٦٠ .

11- Курдоев К.К. Грамматика курдского
языка, Москва-Ленинград,
1956

١١- كوردۆیێف ك. ك. ڕێزمانی زمـــانی كوردی ، مۆســـكۆ - لێنینگراد ،
١٩٥٦ .

2- Курдоев К.К. Грамматика курдского языка на материале диалектов курманджи и сорани, Москва, 1978

١٢- کوردۆییف ك٠ ك٠ ڕێزمانی زمانی کوردی لــە مەتریالی دیالێکتەکانی
کرمانجی و سۆرانی ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ٠

13- Бакаев Ч.Х. Язык азербайджанских курдов, Москва, 1965

١٣- بەکاییف ج٠ خ٠ زمانی کوردەکانی ئازربایجان ، مۆسکۆ ، ١٩٦٥ ٠

14- Бакаев Ч.Х. Язык курдов СССР Москва, 1973

١٤- بەکاییف ج. خ. زمانی کوردەکانی یەکیەتی سۆڤیەت ، مۆسکۆ ، ١٩٧٣.

15- Эйюби К.Р. Курдский диалект
Смирнова И.А. Мукри, Ленинград, 1968

١٥- ئەیوبی ک.ر. دیالێکتی کوردی موکــری ، لێنینگــراد ، ١٩٦٨ .
سمیرنۆڤە ی.ئا.

16- Ибрагим А.И. Сложноподчиненное
предложение с прида-
-точным определитель-
-ным в центральных
диалектах курдского
языка, Москва, 1975 (канд.
дисс.)

١٦- ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم • دکتۆر ، رستەی لێکدراوی شوێن کەوتوو
خواز لەگەڵ رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری لە دیالێکتەکانی ناوەندی
زمانی کوردیدا ، مۆسکۆ ، ١٩٧٥ ، نامەی دکتۆرا وکورتەی نامەکە •
بە روسی •

7- Рубинчик Ю.А. Природа и функции персидского подчини-тельного союза «ке», Краткие сообщения Института Востоковедения АН СССР. М., вып. 36, 1959

١٧- روبنجیك یو• ئا• پریرۆداو وەزیفەی ئامرازی گەیەنەری فارسی « کە »،
کورتە هەواڵەکانی ئامۆژگای رۆژهەڵاتناسی ئەکادیمیای زانستی یەکیەتی
سۆڤیەت » ، مۆسکۆ ، ١٩٥٩ ، دەرچوونی نمرە ـ ژمارەی ـ ٣٦ •

18- Рубинчик Ю.А. Сложные предложения с придаточными предложениями в современном персидском языке, М., 1959

١٨- روبینچك یو. ئا. رستە ئاوێتەکان لەگەڵ رستە شوێنکەوتووە دیارخەریەکان لە زمانی ئیمڕۆی فارسیدا ، مۆسکۆ ، ١٩٥٩ .

19- Калинина З.М. Сложноподчиненное предложение в современной литературе пушту. М., 1966

١٩- کالینینە ز. م. رستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخواز لە زمانی ئەدەبی ئیمڕۆی پوشتودا ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ .

20– Цукерман И.И. Очерк курдской грамматики М., 1962

٢٠ـ سوكرمان ى٠ ى٠ لىكۆڵينەوەيێك لە رێزمانى كوردى ، مۆسكۆ ، ١٩٦٢٠

21– Горюнов В.И. Классификация предложений с придаточным определительными, вводными союзным словом „что جۆ"

в современном литератуном хинди".
"Вопросы языка" лите-
-ратуры", М., 1968

٢١- گەریونۆف ف. ی. تەسنیفی رستە لەگەڵ شوێن کەوتووی دیارخەری، کە بەیارمـەتی ئامرازی نسـبەتدار « دژۆ » ـ « جۆ » بەیـەکـەوە دەبەسترێتەوە . لە زمانی ئەدەبی ئیمرۆی هیندا « پرسیارەکانی زمـان و ئەدەب » مۆسکۆ ، ١٩٦٨ .

22-Ломтев Т.П. Общее и русское
языкознание, Москва,
1976

٢٢-لۆمتۆف ت. ب. زانستی زمانی تێکڕایی وروسی ، مۆسکۆ ، ١٩٧٦ .

23- Mackenzie D.N. Kurdish dialect studies London, 1961 -I-

24- Macaruc Ernest N. A kurdish Grammar, New york, 1958.

25- MQAHATE KöpAo 3bMAHE K'o"pAu - P'E36MAH, EPEBAH-1970.

٢٥- قەناتێ کوردۆ زمانێ کوردی ـ رێزمان ، یەریڤان ، ١٩٧٠ .

## سەرچاوەی نموونەکان


١ ــ دکتۆر مارف خەزنەدار ــ ئەڵەمان کوردی ــ بەغدا ــ ١٩٦٩ .

٢ ــ دکتۆر کاوس قەفتان ــ خۆری ئاوا بوو سلێمانی ١٩٧٠ .

٣ ــ حوسێن عارف ــ کلاٚفەیێك ژانی توورە نەجەف ١٩٧١ .

٤ ــ کەریم شارەزا ــ پەندی پێشینان لە شعری کوردیدا بەغدا ١٩٧٦ .

# ناوەڕۆك

# بەرهەمەکانی دانەر

١ ـ ووتارێك بەناونیشانی « دەربارەی کۆڵینەوە لە سینتاکس زمانی کوردی ، گۆڤاری ( رۆشنبیری نوێ ) ژمارە ( ٥٢ ) آب ، ١٩٧٦ •

٢ ـ حاڵەتەکانی جنس و بینـــای بەرکار لـــە زازادا ، نووسینی پرۆفیسۆر ك• ك• کوردۆییف بەروسی وەرگێڕ لەروســـیەوە د• ئیبراهیم عەزیز بەغدا ، ١٩٧٧ یان بەرگی پێنجی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد •

٣ ـ دانانی کتێبێك بە ناو ونیشانی « ئەلف و بێی زمانی کوردی ، بۆمعاهدی مامۆستایان ، چاپی‌یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٨ •

٤ ـ چەند ووتارێکی هەمـــەڕێکی هەمەڕەنگ لە رۆژنامـــەی هاوکاری و گۆڤاری رۆشنبیری نوێ •

٥ ـ هەندێ ئامرازی سینتاکسی لە زمـــانی ئـــەدەبی ئیمڕۆی کوردیـــدا ـ بەرگی‌یەکەم ـ •

**ئاماده بۆچاپ :**

١ ـ رستەی لێکدراوی شوێن کەوتوو خواز لەگەڵ رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری لە دیالێکتە ناوەندیەکانی زمانی کوردیدا ـ کۆڵینەوەیەکـــی دوور درێژی زانستیانەیە ـ •

**کاری لە ژێر دەست :**

١ ـ وەرگێرانی کتێبی « زانستی زمان » لە نووسینی دکتۆر عەلی عەبدولواحید وافی لەعەرەبیەوە بۆ کوردی •

